# فەزڵ و گەورەیی قورئان خوێندن و

# شێوەکانی خوێندنەوەی

# قورئانی مەجید




نوسینی

هەردی صابر



چاپی یەکەم

١٤٣٦ك - ٢٠١٤ ز

# فەزڵ و گەورەیی قورئان خوێندن و شێوەکانی خوێندنەوەی قورئانی مەجید

نووسینی

هەردی صابر

چاپی یەکەم

١٤٣٥ ك - ٢٠١٤ ز

❁ ناوی کتێب: فەزڵ و گەورەیی قورئان خوێندن و شێوەکانی خوێندنـەوەی قورئانی مەجید

❁ نووسینی: هەردی صابر

❁ نۆبەی چاپ: یەکەم

❁ ساڵی چاپ: ٢٠١٤ ز

❁ تایپ و دیزاین: نووسەر

❁ تیراژ: ١٠٠٠ دانە

❁ چاپخانە: شارستان /سلێمانی

❁ ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمـارەی (١٧٦١) ی ساڵی (٢٠١٤) ی پێ دراوە

**بسم الله الرحمن الرحيم**

## پێشەکی:

**إن الحمد لله، نحمده و نستعينه و نستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا من يهدى الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله..**

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ **( آل عمران : ١٠٢)** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ ﴾ **(النساء : ١)** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ **(الأحزاب : ٧٠ - ٧١)**

**أما بعد، فإن أصدق الحديث كتاب الله، وخير الهدي هدي محمد (ﷺ) وشر الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار.**

زۆر خۆم بە بەختەوەر دەزانم کەوا توانیبێتم لە جیهانی (زانستەکانی قورئان) دا شتێکم نووسیبێ کە موسوڵمانان سوودی لێ وەربگرن و، وە بیکەنە تووێشووی ڕۆژی قیامەتیان.

شایانی باسە سەرجەم فەرموودەکان (تەحقیق) و (تەخریج) کراوە، بۆ ئەم مەبەستە لە ڕووی (تەحقیقات) ە وە زۆر سوودم لە کتێبە تەحقیق

کراوەکانی (شێخ محمد ناصرالدین الألباني) و (سلیم الهلالی) وەرگرتووە (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت).

هەروەها لە ڕووی تەخریج کردنی فەرموودەکانیشەوە برای بچووکتان بەو کارە هەڵساوە.

لە کۆتایی دا داوام وایە لە خوای پەروەردگار کەوا سەرکەوتووم بکات لەم کارەمدا ، بۆ ئەوەی تۆزقاڵێک منیش بەشداربم لە خزمەت کردنی ئایینەکەیدا، وە بیکاتە مایەی سڕینەوەی گوناهەکانم و توێشووی ڕۆژی قیامەت .. آمین یا رب العالمین .

﴿ سُبْحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ * وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ * وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾

**هەردی صابر**

**کوردستان - سلێمانی**

**( ٢١ ) ی ( ذوالحجة ) ی ( ١٤٣٥ ) ی کۆچی**

# بەشی یەکەم
# فەزڵ و گەورەیی قورئان خوێندن

خـوای پـەروەردگار لـەم بارەیـەوە فەرموویـەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرْجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ ﴾ (فاطر: ٢٩)

واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە کتێب و پـەیامی خـوا دەخوێننـەوە و، هـەروەها بەجوانی هەڵدەسن بـە کردنـی نوێژەکـەیان – و بە ڕێـك و پێکی ئـەنجامی دەدەن لە کاتی خۆیدا – و، وە لەو ڕزق و ڕۆزی و سـامانە جـۆراو جۆرانـەی پێمان بەخشیون، بەخشیویانە و داویانە لە ڕێگای خوادا، بـە پـەنهانی و بـە ئاشکرا – واتـە هەنـدێ جـار بـە نهێنـی و پـەنهانی بەخـشیویانە بۆ ئـەوەی نەبێتـە ڕووپامـایی و ڕیـا، وە هەنـدێ جـاریش بـە ئاشـکرا و بـە بەرچـاوی خەڵکەوە بەخـشیویانە تـا خـەڵکانێکی تـریش چاویان لێ بکـەن و هانبـدرێن بۆی– ، ئەوانە بە ئومێدی بازرگانیەك ئەو کارە دەکەن کە هـەرگیز نائومێد نابن و لاوازی و زیان ڕووی تێ ناکات و بەردەوام قازانجی مسۆگەرە.

## یەکەم: فەزڵی فێربوونی قورئان

١- لە (عوسمان) ی کوڕی (عەففان) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( **خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ ، وَعَلَّمَهُ** ))[1].

واتە : چاکترتان ئەو کەسەیە کە فێری قورئان دەبێ و، خەڵکیش فێری قورئان دەکات.

٢- لە (عوقبە) ی کوڕی (عامیر) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( **خرج رسول الله (ﷺ) ونحن في الصفة ، فقال: أيكم يحب أن يغدو كل يوم إلى بطحان ، أو إلى العقيق ، فيأتي منه بناقتين كوماوين في غير إثم ، ولا قطع رحم؟ ، فقلنا: يا رسول الله (ﷺ) نحب ذلك ، قال : أفلا يغدو أحدكم إلى المسجد فيعلم ، أو يقرأ آيتين من كتاب الله عز وجل ، خير له من ناقتين ، وثلاث خير له من ثلاث ، وأربع خير له من أربع ، ومن أعدادهن من الإبل** ))[2]

---

[1] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (فضائل القرآن) ، بابی: (خيركم من تعلم القرآن وعلمه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٠٢٧) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الوتر) ، بابی: (في ثواب قراءة القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٥٢) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (فضائل القرآن) ، بابی: (ما جاء في تعليم القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٩٠٧).

[2] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (صلاة المسافرين وقصرها) ، بابی: (فضل قراءة القرآن في الصلاة وتعلمه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٧٠) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الصلاة) ، بابی: (في ثواب قراءة القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٥٦).

واتە: ئێمە لە (صوففە)* بووین، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات بۆ ناومان ، فەرمووی: کامتان حەزدەکەن کە هەموو ڕۆژێ بچن بۆ شیوی (بوطحان) ، یا بڕۆن بۆ شیوی (عەقیق)، وە لەوێ دوو وشتری مێنگەی دووگ قەوی بهێننەوە بۆ خۆتان ، بەبێ ئەوەی کە بەهۆی ئەوەوە تووشی تاوانێ ببن لەلای خوا، یا تووشی دڵڕەنجاندنی کەس و کارتان ببن و پەیوەندیی خزمایەتی ببچڕێنن؟ وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)! هەموومان حەز لە دەستکەوتی واباش دەکەین، جا کێ حەز لە خێر و بێری وا ناکات؟ فەرمووی: دەسا هەریەکێ لە ئێوە، هەر ڕۆژێ بچێت بۆ مزگەوت ، لەوێ دوو ئایەت لە قورئان فێرببێ ، یا بیخوێنێتەوە، ئەوە لە دوو وشتر باشترە بۆی! وە سێ ئایەت فێرببێ لە سێ وشتر باشترە بۆی، هەروا چوار ئایەت لە چوار وشتر باشترە بۆی، ئیتر هەروا بژمێرە، زیاتری فێربوونی ئایەت لە زیاتری دەستکەوتنی وشتر باشترە.

---

* (**صوففە**): سەکۆیە بوو لەژێر ساباتێکا ، لە مزگەوتەکەی مەدینە بوو ، میوانخانەی موسوڵمانە هەژارەکان بوو.

## دووەم: پلە و پایەی کەسێ کە قورئانی ڕەوانە و کەسێ کە ئەرك دەکێشێ بۆ ڕەوان کردنی

لە دایکە (عائیشە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( **الماهر بالقرآن مع السفرة الكرام البررة ، والذي يقرأ القرآن ويتتعتع فيه ، وهو عليه شاق ، له أجران** ))[٣]

واتە: ئەو قورئان خوێنەی کە بە ڕەوانی قورئانی لەبەرە و ڕەفتاری پێ دەکات ئەوە لە پایەی ئەو مەلائیکە بەڕێزە خێر خوایانە دایە کە لە جیهانی باڵادا و لە عالەمی مەلەکوتدا سەرپەرشتی قورئان دەکەن، وە ئەو کەسەشی کە خەریکە قورئان دەخوێنێ و بەرە بەرە لەبەری دەکا، بەڵام هێشتا زمانی تەتەڵەی تیا دەکا و بەگران بۆی لەبەر دەکرێ، ئەمەش لە جیاتی پاداشتێ دوو پاداشتی باشی بۆ هەیە – واتە: پاداشتێ لە باتی خوێندنەکەی، وە پاداشێ لە باتی دەم تەتەڵە کردنەکەی –.

## سێیەم: ئەجرو پاداشتی قورئان خوێندن

لە (ئیبنومەسعود) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( **من قرأ حرفا من كتاب الله فله به**

---

[٣] **صحيح** – (بوخاری) لە کتابی (التفسير) ، بابی: (سورة ﴿عبس﴾ ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٩٣٧)، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (صلاة المسافرين وقصرها) ، بابی: (فضل الماهر في القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٥٩) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الصلاة) ، بابی: (في ثواب قراءة القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٥٤) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (فضائل القرآن) ، بابی: (ما جاء في فضل قارئ القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٩٠٤) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الأدب) ، بابی: (ثواب القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٧٧٩).

**حسنة ، والحسنة بعشر أمثالها ، لا أقول الم حرف ، ولكن ألف حرف ولام حرف وميم حرف ))**[٤]

واتە: هەر کەسێ پیتێ لە قورئان بخوێنێ بەو پیتە چاکەیەکی بۆ هەیە ، پاداشی چاکەش یەك بە دەیە ، دەی من نالێم (ألم) یەك پیتە ، بەڵکو ئەلیف پیتێکە ، وە لام پیتێکە ، وە میمیش پیتێکە .

**چوارەم: نموونەی ئەو ئیماندارەی کە قورئان دەخوێنێ و ئەوەی کە نایخوێنێ**

لە (ئەبوموسا) ی ئەشعەریەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (( **مثل المؤمن الذي يقرأ القرآن ، مثل الأترجة ، ريحها طيب وطعمها طيب ، ومثل المؤمن الذي لا يقرأ القرآن مثل التمرة ، لا ريح لها وطعمها حلو ، ومثل المنافق الذي يقرأ القرآن ، مثل الريحانة ، ريحها طيب وطعمها مر ، ومثل المنافق الذي لا يقرأ القرآن ، كمثل الحنظلة ، ليس لها ريح وطعمها مر))**[٥]

---

[٤] **حسن** - (ترمذی) لە کتابی (فضائل القرآن) ، بابی: (ما جاء فیمن قرأ حرفا من القرآن ماله من الأجر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٩١٢) ، هەروەها (بەیهەقی) لە کتێبی (شعب الإیمان) دا لە ژێر ناونیشانی: (فصل في إدمان تلاوة القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٢٣) .

[٥] **صحیح** - (بوخاری) لە کتابی (فضائل القرآن) ، بابی: (فضل القرآن على سائر الكلام) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٠٢٠) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (صلاة المسافرين وقصرها) ، بابی: (فضيلة حافظ القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٥٧) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الأدب) ، بابی: (من يؤمر أن يجالس) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٨٣٠) ، هەروەها (ترمزی) لە کتابی (الأمثال) ، بابی: (ما جاء في مثل المؤمن القارىء للقرآن ، وغير القارىء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٨٦٥) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الإیمان) ، بابی: (مثل من يقرأ القرآن من مؤمن ومنافق) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٠٥٣) ، هەروەها (ابن ماجه) لە (المقدمة) ، بابی: (فضل من تعلم القرآن وعلمه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٤).

واتە: وێنەی ئەو باوەڕدارەی کە قورئان دەخوێنێ – و ڕەفتاری پێ دەکات – وەك لیمۆ وایە ، هەم بۆنی خۆشە و هەم تامی خۆشە ، وە وێنەی ئەو باوەڕدارەی کە قورئان ناخوێنێ – و ڕەفتاری پێ بکات – وەك خورما وایە، هەرچەندە بۆنی نیە بەڵام تامی خۆشە ، وە وێنەی ئەو دووڕووەی کە قورئان دەخوێنێ، وەك ڕێحانە وایە ، بۆنی خۆشە بەڵام تامی تاڵە! وە وێنەی ئەو دووڕووەی کە قورئان ناخوێنێ ، وەك گوژاڵك وایە، هەم بۆنی ناخۆشە و هەم تامیشی تاڵە.

## پێنجەم: دابەزینی مەلائیکەی ڕەحمەت لە کاتی قورئان خوێندندا

لە (بەڕڕائی) کوڕی (عازیب) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی : (( **کان رجل یقرأ سورة الکهف وعنده فرس مربوط بشطنین، فتغشته سحابة فجعلت تدور وتدنو ، وجعل فرسه ینفر منها ، فلما أصبح أتى النبي (ﷺ) فذكر ذلك له ، فقال: تلك السكينة تنزلت للقرآن** ))[٦]

واتە : جارێ پیاوێ – کە ناوی (ئوسەید) ی کوڕی (حوزەیر) ە – سورەتی (الکهف) دەخوێنێ ، لەو کاتەدا ماینەکەی لە لایەوە بە دوو گوریس بەسرابۆوە ، جا لە کاتی قورئان خوێندنەکەدا پەڵە هەورێ بەسەریا دەدا و دەست دەکا بە سوڕخواردن بە دەوریا و لێی نزیك دەبێتەوە ،

---

[٦] **صحیح** – (بوخاری) لە کتابی (فضائل القرآن) ، بابی: (فضل الکهف) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٠١١)، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (صلاة المسافرین وقصرها) ، بابی: (نزول السکینة لقراءة القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٥٣).

ماینەکەیشی کە ئەمە دەبینێ سڵی لێ دەکا و هەڵ دەسڵەمێتەوە ، جا بۆ بەیانی هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) و ئەمەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: ئەوە – مەلائیکەی – ئاسایش و ئارامی بووە لەبەر قورئان دابەزیوە.

## شەشەم: قورئان دەبێتە تکاکار بۆ ئەوکەسەی خوێندویەتیەوە و کردەوەی پێکردووە

لە (ئەبی ئومامە) ی باهیلییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: بیستم پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: (( **اقرءوا القرآن ، فإنه يأتي يوم القيامة شفيعا لأصحابه** ))[٧]

واتە : قورئان بخوێنن چونکە لە ڕۆژی قیامەتا قورئان دێ ، لەسەر شێوەیەکی وا خەڵکی مەحشەر بە چاوی خۆیان دەیبینن ، دەبێ بە تکاکار بۆ هاوڕێیانی خۆی.

**بەتایبەتی خوێندنی سورەتی (البقرة) و (آل عمران):**

لە (ئەبی ئومامە) ی باهیلییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: بیستم پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: ((... **اقرءوا الزهراوين البقرة، وسورة آل عمران، فإنهما تأتيان يوم القيامة كأنهما غمامتان، أو كأنهما غيايتان، أو كأنهما فرقان من طير صواف، تحاجان**

---

[٧] **صحيح** – (موسليم) لە کتابی (صلاة المسافرين وقصرها) ، بابی: (فضل قراءة القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٧١) ، هەروەها لە (تحفة الأشراف) دا بە ژمارە (٤٩٣١) هاتووە .

**عن أصحابهما، اقرءوا سورة البقرة، فإن أخذها بركة، وتركها حسرة، ولا تستطيعها البطلة))** [8]

واتە: بە تایبەتی ئەم دوو سورەتە درەخشانە بخوێنن، کە بریتی یە لە سورەتی (البقرة) و (آل عمران)، کە ناوبانگیان زەهراوەینە – واتە: دوو چرای درەخشان – چونکە ئەو دوو سورەتە لە ڕۆژی قیامەتا دێن لە دوو پەڵە هەور دەچن یا لە دوو سابات دەکەن، یا وەك دوو پۆلەمەل و ڕەوە باڵندە وان کە لە حەوا ڕیز دەبەستن و باڵیان ڕەپ دەکەن، حاڵیان وایە لەسەر دۆستان و یارانی خۆیان دەکەنەوە و لەسەریان هەڵدەدەنێ، بە تایبەتی سورەتی (البقرة) زۆر بخوێنن، چونکە بەڕاستی وەرگرتن و خوێندنی پیت و فەڕ و بەرەکەتە و، لە کیس چوونیشی جێی داخ و خەفەتە، سەرەڕای ئەوەیش جادووگەرانیش دەرەقەتی نایەن.

## حەوتەم: خوای گەورە پلەو پایەی کەسانێ بەرز دەکاتەوە کە خزمەتی قورئان دەکەن

لە (عامیر) ی کوڕی (واثیل) ە وە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: **(( أن نافع بن عبد الحارث ، لقي عمر بعسفان ، وكان عمر يستعمله على مكة ، فقال: من استعملت على أهل الوادي ، فقال: ابن أبزى ، قال: ومن ابن أبزى؟ قال: مولى من موالينا ، قال: فاستخلفت عليهم مولى؟ قال: إنه قارئ لكتاب الله عز وجل ، وإنه عالم بالفرائض ، قال عمر:**

---

[8] **صحيح** - (موسليم) لە کتابی (صلاة المسافرين وقصرها)، بابی: (فضل قراءة القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٧١)، هەروەها لە (تحفة الأشراف) دا بە ژمارە (٤٩٣١) هاتووە.

**أما إن نبيكم (ﷺ) قد قال: إن الله يرفع بهذا الكتاب أقواما ، ويضع به آخرين ))**[9]

واته : (نافیعی کوڕی عبدالحارث) له (عوسفان) گەیشت به (عومەری کوڕی خەتتاب) (خوای لێ ڕازی بێت) ، کە (نافیع) کاربەدەستی (عومەر) بوو، لەسەر شاری (مەککە) لەوکاتەدا ، (عومەر) بە (نافیع) ی فەرموو: ئەی (نافیع) لەجێی خۆت کێت داناوە بە سەرەوکاری مەککە، کاتێ هاتیت بۆ ئێرە؟ وتی: (کوڕی ئەبزا)* م داناوە لە شوێنی خۆم، (عومەر) فەرمووی: (کوڕی ئەبزا) کێ یە ؟ (نافیع) وتی: دۆستێکی ئازاد کراوی بنەماڵەی ئێمەیە ، (عومەر) فەرمووی: بەندەیەکی ئازاد کراوت کردووە بەسەرەوکار ، بەسەر دانیشتوانی مەککەوە، (نافیع) وتی: ئەی فەرمانڕەوای بڕواداران من لەبەر ئەم دوو ڕەوشتە باشە ئەو کۆنە بەندەیەم کردووە، بە سەرەوکاری مەککە، چونکە یەکەم: قورئان خوێنێکی چاکە و نامەی خوای گەورەو سەروەری بە باشی خوێندووە، دووەمیش: فەرائیززانێکی چاکە و زانستی کەلەپوور دابەش کردن بە جوانی دەزانێ. (عومەر) یش فەرمووی: چونکە پێغەمبەرەکەتان (ﷺ) دەفەرموێ: بێگومان خوای گەورەو سەروەر ، کۆمەڵێ خەڵك ، بەهۆی خزمەتی ئەم قورئانەوە ، کە نامەی خوایە ، پایە و پلەیان لە هەردوو جیهاندا ، بەرز دەکاتەوە، وە هەروەها پلە و پایەی

---

[9] **صحيح** – (موسلیم) لە کتابی (صلاة المسافرين وقصرها) ، بابی: (فضل من يقوم بالقرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٩٤) ، هەروەها (ابن ماجه) له (المقدمة) دا ، بابی: (من تعلم القرآن وعلمه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٨).

* (ابن أبزى) ناوی: (عبدالرحمن) ە.

کۆمەڵێ خەڵکی تر ، بەهۆی بێ خزمەتییان بۆ ئەم قورئانە نزم و نەوی دەکاتەوە ؟

## هەشتەم: حەسوودی تەنها لە دوو شتا دروستە

لە (ئیبنوعومەر) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (( **لا حسد إلا في اثنتين: رجل آتاه الله القرآن فهو يقوم به آناء الليل ، وآناء النهار ، ورجل آتاه الله مالا ، فهو ينفقه آناء الليل ، وآناء النهار**))[10]

واتە: حەسوودی دروست نیە لە دوو شتدا نەبێت: پیاوێ کە خودا فێری قورئانی کردبێ و، ئەویش بە شەوو بە ڕۆژ پێی هەڵبستێ و دەوری بکاتەوە، وە پیاوێ خودا ماڵی ڕەحمەتی پێ بەخشیبێ ، ئەویش درێغی لێ نەکا و بە شەوو بە ڕۆژ خێر و چاکەی لێ بکات.

[10] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (التوحيد) ، بابی: (قول النبي (ﷺ): رجل آتاه الله القرآن فهو يقوم به آناء الليل وآناء النهار) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٥٢٩) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (صلاة المسافرين وقصرها) ، بابی: (فضل من يقوم بالقرآن ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٩١) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (البر والصلة) ، بابی: (ما جاء في الحسد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٣٦) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الزهد) ، بابی: (الحسد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٢٠٩).

# بەشی دووەم

# دابەزینی قورئان لەسەر حەوت پیت

## یەکەم: قورئان بە حەوت شێوە خوێندنەوە هاتۆتە خوار

١- لە (ئیبنوعەبباس) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن رسول الله (ﷺ) ، قال: **أقرأني جبريل** (عليه السلام) **على حرف، فراجعته، فلم أزل أستزيده فيزيدني، حتى انتهى إلى سبعة أحرف**))[11]

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (جوبرەئیل) لەسەر یەك شێوە (حەرف: قیرائەت) قورئانی پێ دەخوێندم، منیش هەموو جارێ هەر داوام لێ دەکرد کە شێوەکان زیاد بکا ئەویش بۆی زیاد دەکردم هەتا لە ئەنجاما ژمارەی شێوەکانی خوێندن (قیرائات) ی قورئان لەسەر حەوت شێوەی جوان کۆتاییان هات.

٢- لە (ئوبەی) کوڕی (کەعب) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن النبي (ﷺ) **كان عند أضاة بني غفار، قال: فأتاه جبريل** (عليه السلام) ، **فقال: إن الله يأمرك أن تقرأ أمتك القرآن على حرف، فقال: أسأل الله معافاته ومغفرته، وإن أمتي لا تطيق ذلك ، ثم أتاه الثانية، فقال: إن الله يأمرك أن تقرأ أمتك القرآن على حرفين، فقال: أسأل الله معافاته**

---

[11] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (فضائل القرآن) ، بابی: (أنزل القرآن على سبعة أحرف) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٩٩١) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (صلاة المسافرين وقصرها) ، بابی: (بيان أن القرآن على سبعة أحرف وبيان معناه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٩٩)

**ومغفرته، وإن أمتي لا تطيق ذلك ، ثم جاءه الثالثة ، فقال: إن الله يأمرك أن تقرأ أمتك القرآن على ثلاثة أحرف، فقال: أسأل الله معافاته ومغفرته، وإن أمتي لا تطيق ذلك ، ثم جاءه الرابعة ، فقال: إن الله يأمرك أن تقرأ أمتك القرآن على سبعة أحرف ، فأيما حرف قرءوا عليه فقد أصابوا ))**[12]

واتە : جارێ پێغەمبەر (ﷺ) لەلای گۆلاوەکەی بەنی غیفار بوو، (جوبرەئیل) (سەلامی خوای لەسەر بێ) هات بۆلای ، فەرمووی: کە خوای گەورە فەرمانت پێ دەکا کە لەسەر یەك شێوە قورئان بە گەلی خۆت بخوێنە، پێغەمبەریش دەفەرموێ: لە خوا داوا دەکەم کە بە گەورەیی خۆی بێ نیاز و سەرفراز و بێ وەیمان بکا و چاوپۆشی لە گوناهمان بکا ، وەلێ بەڕاستی گەلەکەم توانای ئەوەی نیە، لەپاشا دووبارە (جوبرەئیل) (سەلامی خوای لەسەر بێ) هاتەوە بۆلای و فەرمووی: خودا پێت دەفەرموێ: کە لەسەر دوو شێوە قورئان بە گەلی خۆت بخوێنە، پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێتەوە: لە خوا داوا دەکەم کە بە گەورەیی خۆی بێ نیاز و سەرفراز و بێ وەیمان بکا و چاوپۆشی لە گوناهمان بکا، بەلام بەڕاستی گەلەکەم تاقەتی ئەوەی نیە چونکە زاراوە و شێوەی زمان و قسەکردنیان جوێ جوێ یەو بە گران دەتوانن کە بە غەیری شێوەی خۆیان بخوێنن، لەپاشا جاری سێیەم هاتەوە بۆلای و فەرمووی: خودا پێت دەفەرموێ: کە لەسەر سێ شێوە قورئان بە

---

[12] **صحيح** - (موسليم) لە کتابی (صلاة المسافرين وقصرها) ، بابی: (بيان أن القرآن على سبعة أحرف وبيان معناه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٠٣) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الصلاة) ، بابی: (أنزل القرآن على سبعة أحرف) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٧٨) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الإفتتاح) ، بابی: (جامع ما جاء في القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٣٨).

گەلەکەت بخوێنە، پێغەمبەریش (ﷺ) دیسان فەرمووی: داوا دەکەم لە خوا کە بە گەورەیی خۆی بێ نیاز و سەرفراز و بێ وەیمان بکا و چاوپۆشی لە تاوان و گوناهمان بکا ، بەڵام بەڕاستی گەلی من تەوانای ئەوەشیان نیە، ئنجا لەسەرەی جاری چوارەما (جوبرەئیل) (سەلامی خوای لەسەر بێ) کە دێتەوە بۆلای دەفەرموێ: خودا فەرمانت پێ دەکا کە گەلەکەت بە حەوت شێوە قورئان بخوێنن ، ئیتر بە هەر کامێ لەو حەوت شێوە قورئان بخوێنن دەی پێکەنن و لە نیشانە دەدەن.

٣- لە (عومەر) ی کوڕی (خەتتاب) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( **سمعت هشام بن حكيم بن حزام ، يقرأ سورة الفرقان على غير ما أقرؤها ، وكان رسول الله (ﷺ) أقرأنيها ، وكدت أن أعجل عليه، ثم أمهلته حتى انصرف، ثم لببته بردائه، فجئت به رسول الله (ﷺ) ، فقلت: إني سمعت هذا يقرأ على غير ما أقرأتنيها، فقال لي: أرسله ، ثم قال له: اقرأ ، فقرأ ، قال: هكذا أنزلت، ثم قال لي: اقرأ ، فقرأت، فقال: هكذا أنزلت إن القرآن أنزل على سبعة أحرف، فاقرءوا منه ما تيسر** ))[١٣]

[١٣] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الخصومات) ، بابی: (كلام الخصوم بعضهم في بعض) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٤١٩) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (صلاة المسافرين وقصرها) ، بابی: (بيان أن القرآن على سبعة أحرف وبيان معناه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٩٦) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الصلاة) ، بابی: (أنزل القرآن على سبعة أحرف) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٧٥) ، هەروەها (ترمزی) لە کتابی (القراءات) ، بابی: (ما جاء أنزل القرآن على سبعة أحرف) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٩٤٣) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الإفتتاح) ، بابی: (جامع ما جاء في القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٣٥).

واتـە : گـوێم لـە (هـیشام) ی کـوڕی (حـەکیم) بـوو، سـورەتی (الفرقـان) ی دەخوێند، شێوەی خوێندنەکەی ئەو جیا بوو لەگـەڵ شـێوەی خوێندنەکـەی مندا، منیش قورئانەکەم لەلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆی خوێـند بـوو، جـا خەریك بووم هەر لەناو نوێژەکەیدا پـەلاماری بـدەم، بـەڵام مۆڵـەتیم دا هـەتا سەلامی دایەوە، ئەوسا توونـد یەخەیم گرت و بەرۆکی پۆشاکەکەیم لوولدا بـە ملیەوە و بەو شێوەیە بە ڕاکێشان بـردم بـۆلای پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) وتم: قوربان! ئەمە سورەتی (الفرقان) ی دەخوێند، بە شێوەیە دەیخوێنێ جیایە لەگـەڵ ئـەوەدا کـە مـن لـەلای تـۆ خوێندوومـە! فـەرمووی: جـارێ یەخـەی بـەردە، ئـەی هیـشام! ئـادەی بخوێنـە جـا ئـەویش لەسـەر ئـەو شـێوەیەی پێشوو کە من گوێم لێ بـوو خوێنـدی، پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: ئاوەهـاش هاتۆتە خوارەوە، ئنجا فەرمووی بە منـیش: ئـادەی تـۆیش بخوێنـە، منـیش لەسـەر شـێوەکەی خـۆم کـە لـە پێغەمبـەرم (ﷺ) وەرگرتبـوو خوێنـدم، فەرمووی: ئاوەهاش هاتۆتـە خـوارەوە ، ئەمـەش قەیـدی نیـە، چـونکە ئـەم قورئانە بە حەوت شێوە نێرراوەتە خوارەوە جـا ئێـوە بـە کـام شـێوەیە بـە ئاسانی بۆتان دەخوێندرێ بەو شێوەیە بیخوێنن.

٤- لە (ئوبەی) کوڕی (کەعب) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنـەوە کـەوا وتوویەتی: (( **كنت في المسجد ، فدخل رجل يصلي، فقرأ قراءة أنكرتها عليه، ثم دخل آخر فقرأ قراءة سوى قراءة صاحبه ، فلما قضينا الصلاة دخلنا جميعا على رسول الله (ﷺ) ، فقلت: إن هذا قرأ قراءة أنكرتها عليه، ودخل آخر فقرأ سوى قراءة صاحبه ، فأمرهما رسول الله (ﷺ) ، فقرآ ، فحسن النبي (ﷺ) شأنهما ، فسقط في نفسي من التكذيب، ولا إذ كنت في**

**الجاهلية ، فلما رأى رسول الله (ﷺ) ما قد غشيني، ضرب في صدري، ففضت عرقا وكأنما أنظر إلى الله عز وجل فرقا، فقال لي: يا أبي أرسل إلي أن اقرأ القرآن على حرف ، فرددت إليه أن هون على أمتي ، فرد إلي الثانية اقرأه على حرفين، فرددت إليه أن هون على أمتي ، فرد إلي الثالثة اقرأه على سبعة أحرف، فلك بكل ردة رددتكها مسألة تسألنيها ، فقلت: اللهم اغفر لأمتي، اللهم اغفر لأمتي، وأخرت الثالثة ليوم يرغب إلي الخلق كلهم، حتى إبراهيم (ﷺ) ))**[١٤]

واته : جارێ له مزگەوت بووم، پیاوێ هاته ژوورەوه، دەستی کرد به نوێژ کردن، قورئانی خوێند، کەچی لەسەر شێوەیەکی وای خوێند که من به دڵم نەبوو، ڕەخنەم لێی هەبوو، له پاشا پیاوێکی تر هات، به شێوەیەکی تر خوێندی، که له نوێژەکەیان بوونەوه پێکەوه چووینه خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتم: ئەمەیان قورئانەکەی به شێوەیەکی وا خوێند که به دڵی من نییه، کەچی ئەمەش هات ئەویش به جۆرێکی تر خوێندی! پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێ کردن و بەرو دوا دەوری قورئانەکەیان کردەوه بۆی، له پاشا ئافەرینی هەردووکیانی کرد، جا منیش ئەم جیاوازیەم لەلا سەیر بوو، وه له دڵما جێگەی نەبۆوه بۆیه بێ بڕواییەکی وا هات به دڵما که له سەردەمی نەزانی پێش ئیسلامیشدا ئاوا بێ بڕوا نەبووم له دڵی خۆمدا پەشیمانی و خەم و خەفەتم پەیدا کرد و وتم : ئەمه چەنی بەچەنه؟! جا که پێغەمبەر

---

[١٤] **صحيح** - (موسلیم) له کتابی (صلاة المسافرين وقصرها) ، بابی: (بيان أن القرآن على سبعة أحرف وبيان معناه) گێڕاویەتەوه به ژماره (١٩٠١) ، هەروەها (ئەبوداود) له کتابی (الصلاة) ، بابی: (أنزل القرآن على سبعة أحرف) گێڕاویەتەوه به ژماره (١٤٧٨).

(ﷺ) چاوی بەم حاڵە کەوت و تەماشای کرد من وەها بزڕکاوم دەستێکی دا بە سینگما، ئیتر لەشم نیشتە سەر ئارەق و ترسێکی وەهام لێ نیشت دەتگوت بە چاوی سەر تەماشای خوای گەورە و سەروەر دەکەم و ئارەقی شەرمم دەردا، ئەوجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی (ئوبەی)! خودا سرووشی بۆ ناردم کە قورئان بە شێوەیە بخوێنە، منیش وەڵامم بۆ ناردەوە و عەرزیم کرد: کە باری گەلی من سووك بکە، جا دووبارە خودا سرووشی بۆم ناردەوە ، ئەمجارە فەرمووی: دەی لەسەر دوو شێوە بیخوێنە، بەڵام دیسان عەرزیم کردەوە : کە بارو کاری خوێندن لەسەر گەلەکەم سووکتر بکە، تا خوا لە جاری سێیەما سرووشی بۆ ناردمەوە و ئەمجا فەرمووی : دەی لەسەر حەوت شێوە بیخوێنە، وە لە باتی ئەم سێ جارەش کە تۆ بۆ پترکردنی ئەم شێوەیانە موراجەعەی منت کردەوە سێ دڵخوازی خۆتت بۆ جێ بەجێ دەکەم ، کە خۆت هەڵیان بژێری و لە منیان داوا بکەی منیش دوانیانم بەم شێوەیە لە خوا داواکرد و وتم: ئەی خوایە! لە ئوممەتم خۆشبە، ئەی خوایە! لە ئوممەتم خۆشبە، وە داوای سێیەمیشم هەڵگرتووە بۆ ئەو ڕۆژەی کە سەرجەم دروستکراوانی خوا کاریان تێم دەکەوێ، تەنانەت لەو ڕۆژە تووش و سەختەدا هەڵوێست وا شلۆق دەبێ (ئیبراهیم) پێغەمبەریش (سەلامی خوای لەسەر بێت) هاوارم بۆ دێنێ!

## دووەم: واتای حەوت پیتەکە*

زانایان لە واتای فەرموودەی (سبعة الأحرف) دا چەند بۆچوونێکی جیاوازیان هەیە، بە کورتی خۆی لە چەند ڕایەکی جیاوازدا دەبینێتەوە:

**یەکەم: (سبعة الأحرف):** بە واتای حەوت جۆر لەهجەی جیاوازی زمانی عەرەبی ڕەوان دێت ، چونکە وشەی (أحرف) کۆی وشەی (حرف) ە، لێرەشدا مەبەست لە واتای (حرف) لەهجە و شێوازێکە لە لەهجەکانی زمانی عەرەبی، وەکو:

١- لەهجە و زمانی ئاخاوتنی (قورەیش).

٢- لەهجە و زمانی ئاخاوتنی (هەوازین).

٣- لەهجە و زمانی ئاخاوتنی (هوذەیل).

ئەمەش ڕای زۆرێك لە زانایانە لەوانە: (قاسمی کوڕی سەلام) و، (ابن عطیة) و، جگە لەوانیش.

وە (ابن الجزري) دەفەرموێ: زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە (سبعة الأحرف) بریتیە لە زمانی ئاخاوتنی حەوت قەبیلەی عەرەب.

**دووەم:** کۆمەڵێکی تر لە زانایان وەك: (ئەبو فەزڵی ڕازی) و، (ئیبنوقوتەیبە) و، (ابن الجزري) و، جگە لەوانیش ڕایان وایە: کە (سبعة الأحرف) بە حەوت شێوە واتای موتتەفیق دەوترێ کە لەفزەکانی لەیەك جوودابن:

**١-** جیاوازی لە سەرو بۆردا (الحرکات) بەڵام بەبێ گۆڕینی واتا و شێوەی نووسینەکەی، وەکو: (البخل).

---

* (معجم القراءات/ ج ١١ ، ص ١٨ – ١٩).

٢- گۆڕین تەنها لە واتا و مەبەستدا ، وەکو: ﴿فتلقى آدم من ربه كلمات﴾.

٣- گۆڕین لە پیت و حەرفدا کە ببێتە هۆی گۆڕینی واتاکەی، بەڵام بەبێ گۆڕینی شێوەی نووسینەکەی، وەکو: (تبلو- تتلو) ، (ننحيك ببدنك - ننجيك ببدنك).

٤- گۆڕینی شێوەی نووسینەکەی بەڵام بەبێ گۆڕینی واتاکەی، وەکو: (بصطة - بسطة) ، (الصراط - السراط).

٥- گۆڕینی شێوەی نووسین و واتاکەشی، وەکو: (أشدَ منكم - منهم)، (يَأتَلِ - ويتألِ).

٦- پاش و پێش خستنی وشەکان، وەکو: (وجاءت سكرة الحق بالموت).

٧- زیاد و کەمی پیتەکان، وەکو: (أوصى ، وصى) ، (والذكر - والأنثى).

**تێبینیەکی زۆر گرنگ:**

دابەزینی قورئان بە حەوت شێوە پیتی جیاواز بریتی نییە لە حەوت قورئان خوێنە بەناوبانگەکان (قیرائاتی سەبعە)، بەڵکو ئەمە جۆرە تێکەڵ بوونێکە کە بەهۆی ژمارە (حەوت) ە وە لە هەردووکیانا ڕوویداوە، چونکە (حەوت جۆر قورئان خوێندن) ە وە کە (قیرائاتی سەبعە) لە سەدەی چواری کۆچیدا لەسەر دەستی زانا و پێشەوای قورئان خوێنەکان (ابن مجاهد) هەمووی کۆکردۆتەوە و ناوی لێ ناون (قیرائاتی سەبعە)، کە ئەوە فاصیلە و نێوانێکی زۆر گەورەیە لە نێوان فەرموودەی (سبعة الأحرف) و (قیرائاتی سەبعە) دا.

شێخی ئیسلام (ئیبنوتەیمیە) ش فەرموویەتی: هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان زانایاندا لەسەر ئەوەی (سبعة الأحرف) کە پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەکەیدا ئاماژەی پێکردووە، بریتی نییە لە حەوت قورئان خوێنە بەناوبانگەکە (قیرائاتی سەبعە).

هەروەها ئەو موصحەفەی کە پێشەوا (عوسمان) موسوڵمانانی لەسەر کۆکردەوە بۆ ئەوەی جیاوازییان نەبێ لە قورئان خوێندنا لەسەر لەهجە و زمانی ئاخاوتنی (قورەیش) بووە، وە ئەو حەوت قورئان خوێنە بەناوبانگەش کە قورئانیان خوێندووە لەسەر ئەو موصحەفەی کە لەسەر لەهجە و زمانی ئاخاوتنی (قورەیش) نووسراوەتەوە قورئانیان خوێندووە، کەواتە (قیرائەی سەبعە) بریتی نییە لە حەوت شێوە لەهجە و زمانی ئاخاوتن (سبعة الأحرف) کە قورئانی پێ دابەزیوە.

## سێیەم: ئەو لوغەیەی کە قورئانی پێ نووسراوەتەوە

لە (ئەنەس) ی کوڕی (مالیك) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( **أن حذيفة بن اليمان ، قدم على عثمان وكان يغازي أهل الشأم في فتح أرمينية ، وأذربيجان مع أهل العراق، فأفزع حذيفة اختلافهم في القراءة ، فقال حذيفة لعثمان : يا أمير المؤمنين، أدرك هذه الأمة ، قبل أن يختلفوا في الكتاب اختلاف اليهود والنصارى، فأرسل عثمان إلى حفصة: أن أرسلي إلينا بالصحف ننسخها في المصاحف، ثم نردها إليك، فأرسلت بها حفصة إلى عثمان ، فأمر زيد بن ثابت، وعبد الله بن الزبير، وسعيد بن العاص، وعبد الرحمن بن الحارث بن هشام فنسخوها في**

**المصاحف، وقال عثمان للرهط القرشيين الثلاثة: إذا اختلفتم أنتم وزيد بن ثابت في شيء من القرآن فاكتبوه بلسان قريش، فإنما نزل بلسانهم، ففعلوا حتى إذا نسخوا الصحف في المصاحف ، رد عثمان الصحف إلى حفصة ، وأرسل إلى كل أفق بمصحف مما نسخوا ، وأمر بما سواه من القرآن في كل صحيفة أو مصحف ، أن يحرق ، قال ابن شهاب: وأخبرني خارجة بن زيد بن ثابت ، سمع زيد بن ثابت قال : فقدت آية من (الأحزاب) : حين نسخنا المصحف ، قد كنت أسمع رسول الله (ﷺ) يقرأ بها ، فالتمسناها فوجدناها مع خزيمة بن ثابت الأنصاري: ﴿ من المؤمنين رجال صدقوا ما عاهدوا الله عليه ﴾ فألحقناها في سورتها في المصحف ))[15]**

واته : (حوزەیفەی کوڕی یەمان) هات بۆلای (عوسمان) لەوکاتەدا خەریک بوو لەشکری ڕێك دەخست لە خەڵکی شام و لە خەڵکی عێراق بۆ گرتن (فەتح) ی وڵاتی (ئازەربیجان) و شاری (ئەرمێنیە) ، (حوزەیفە) تۆقی و ترسی لێ نیشت لەو جیایی و جیاوازیەی کە پەیدا بوو لە نێو قورئان خوێنەکاندا لە هەندێ شێوەی قورئان خوێندندا ، چونکە خەڵکی شام بە قیرائەت (شێوە) ی (ئوبەی کوڕی کەعب) دەیان خوێند و، خەڵکی عێراق بە شێوەی (ئیبنومەسعود) دەیان خوێند، تەنانەت وەختبوو فەرتەنە لە نێوانیاندا بەرپا ببێ، جا (حوزەیفە) لە پاش گرتنەکە کە گەڕانەوە نەچووە

---

[15] **صحیح** - (بوخاری) لە کتابی (فضائل القرآن) ، بابی: (جمع القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٩٨٧) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (تفسیر القرآن) ، بابی: (ومن سورة التوبة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٠٤) ، هەروەها (عبد بن حمید) لە موسنەدەکەیدا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٤٦).

ماڵی خۆی تـا چووه خزمـەتی (عوسمـان) ، وتـی پێـی: ئـەی فـەرمانڕەوای باوەڕداران! فریای ئەم ئوممەتە بکەوە و بیگەرێ تـا وەك جوولەکـە و گـاور لەناو خۆیانا لە نامەی خوادا کە قورئـانی پـیرۆزە دووبـەرەکی و جیاوازییـان تێ نەکەوتووە، (عوسمان) ناردیـە لای (حەفـصەی کچی عومـەر): کـە ئـەو قورئانەی لاتە بۆمان بنێرە، تا چەند دانەیـە قورئـانی لێ دەگرینـەوە ئەوسـا دەینێرینەوە بۆت، (حەفصە) ش بۆی نارد، جا (عوسمان) دەستووری دا بە (زەیـدی کـوڕی سـابت) و (عبـدالله) ی کـوڕی (زوبـەیر) و (سـەعیدی کـوڕی عاص) و (عبدالرحمن) ی کوڕی (حاریسی کوڕی هیشام) چەند قورئانێکیـان لەبەر ئەو بەرگە قورئانەی (حەفـصە) نووسـیەوە و حـەوت دانـەیان لەبـەری ڕوونـووس کـرد، ئـەم دەسـتەی قورئـان نوسـینەوەیە کـە بـە سـەرۆکایەتی (زەید) ، وە بە چاودێری (عوسمان) خۆی بوو سـێ کەسـیان (قـوڕەیش) ی بوون، (عوسمان) بەو سێ کەسەی فەرموو: ئەگەر ڕێکەوت ئێـوە و (زەیـدی کوڕی سابت) کە (قوڕەیشی) نیە لەسەر وشەیە یا شتێ لـە قورئانەکـە ڕێـك نەکـەوتن کـە چـۆنی بنووسـن، ئـەوە لـەم کاتـەدا بـە زمـانی (قـوڕەیش) بینووسـن، چـونکە خـۆی زوربـەی بـە شـێوەی زمـانی (قـوڕەیش) هاتۆتـە خوارێ، ئەوانیش وایان کرد، جا ئکە ئەو قورئانەیان ڕوو نووس کـرد لـە نـاو چەند دەفتەرێکی تردا و چەن وێنەیەکی تریان لێ گرتەوە ئەوجا (عوسمـان) قورئانەکەی (حەفصە) ی ناردەوە بۆی ، لەپاشا لـەو قورئانانـەی کـە ڕوو نووسیان کردن (عوسمان) سەرودانەی نارد بۆ هەموو لایـە، وە دانەیەکیـشی لای خـۆی گلدایـەوە و دوای ئـەوە (عوسمـان) فـەرمانی دا کـە هەرچـی تـر

نووسراوه، چ پارچه و تۆمار، چ قورئانی تەواو کە بسووتێنرێ. (زەیدی کوڕی سابت) دەفەرموێ: ئەو کاتە کە قورئانمان دەنووسیەوە، لە سورەتی (الأحزاب) ئایەتێکم لێ بزربوو، گەلێ جار لە پێغەمبەرم (ﷺ) دەبیست کە لە ژیانیدا دەیخوێند، جا کە بۆی گەڕاین لەلای (خوزەیمەی کوڕی سابیتی) ئەنصاری دۆزیمانەوە، ئەو ئایەتەش ئەمەیە: ﴿مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ رِجَالٞ صَدَقُواْ مَا عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيۡهِۖ فَمِنۡهُم مَّن قَضَىٰ نَحۡبَهُۥ وَمِنۡهُم مَّن يَنتَظِرُۖ وَمَا بَدَّلُواْ تَبۡدِيلٗا﴾* ئیتر لە شوێنی خۆیدا لە سورەتەکەی خۆیدا لەناو قورئاندا دامان نا.

* (الأحزاب : ٢٣).

# بەشی سێیەم
# شێوەکانی خوێندنەوەی قورئانی مەجید

## یەکەم: مەرتەبە و پلەکانی قورئان خوێندن

**١) تەحقیق:** بریتی یە لە قورئان خوێندن بە شێوەیەکی زۆر لەسەرخۆ و دڵنیابەخش لەگەڵ تێڕامان لە ئایەتەکان و، پەیڕەوکردنی یاساکانی (تەجوید) و، داننان بە پیتەکاندا و، دەرهێنانی پیتەکان لە شوێنی خۆیانا لەناو دەم و گەروودا.

**٢) حەدر:** بریتی یە لە قورئان خوێندن بە شێوەیەکی خێرا و پەلە لەگەڵ ڕەچاوکردنی یاساکانی (تەجوید) دا.

**٣) تەدویر:** بریتی یە لە قورئان خوێندن بە شێوەیەکی مامناوەند، کە لە نێوان خوێندنی (تەحقیق) و (حەدر) دایە.

**وە هەندێ لە زانایان:** پلەی (تەرتیل) بە پلەیەکی سەربەخۆ لەدوای پلەی (تەحقیق) ە وە دادەنێن و، خوێندنەوەش لە هەردووکیاندا بە هێواشی و لەسەرخۆیە، وە بەوە لێکیان جیادەکەنەوە کە: (تەحقیق) بۆ فێربوونە، چونکە شێوازێکی لەسەرخۆ و خاوترە و یاساکانی (تەجوید) باشتر تیایدا جێ بەجێ دەکرێت، بەڵام (تەرتیل) ئەو شێوازەیە کە خوێنەر دوای فێربوونی قورئان بەجوانی لەسەری بەردەوام دەبێ و تووشی هیچ هەڵەیەک نابێت تیایدا.

**تێبینی: دوو جۆر قورئان خوێندنی تر هەیە کە بریتین لە[*]:**

**١) (زەمزەمە):** واتە: قورئان خوێن لەبەر خۆیەوە و بە دەنگێکی نزم بۆ خۆی قورئان بخوێنێ و کەسانی دەورو پشتی بە باشی نەیبیستن.

**٢) (هەذرەمە):** واتە: قورئان خوێن بە شێوازێکی زۆر پەلە و خێرا بەبێ ڕەچاوکردنی (یاساکانی تەجوید) قورئانەکەی بخوێنێ و، هیچ تێڕامان و بیرکردنەوەیەکیشی نەبێ بۆ ئایەتەکان و، هەروا بە سانایی بەسەریانا تێ پەڕێت.

## دووەم: پایەکانی قیرائەی ڕاست و دروست [*]

زانایانی ئەم بوارە (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ) چەند (ضوابط) ێکیان بۆ قیرائەی ڕاست و دروست داناوە، کە بتوانێ قیرائەی (مشهور) لە (شاذ)، وە قیرائەی (صحیح) لە غەیری خۆی جیا بکاتەوە .

جا بۆ ئەو مەبەستە سێ مەرجیان داناوە بۆ قیرائەی (صحیح):

**١)** موافقی زمانی عەرەبی بێت، واتە: لەو خوێندنەوانە بێ کە بەربڵاوەوە و لە پێشەوایانی قورئان خوێنە شارەزاکان (قراء) ە وە بە سەنەدێکی ڕاست و دروست هاتبێ.

**٢)** موافقی یەکێ لە مەصاحیفی عوسمانی بێت.

**٣)** ڕاست و دروستی سەنەدی قیرائەکە، واتە: کەسێکی دادپەروەری بیرتیژ گێڕابێتیەوە.

---

[*] (نهاية القول المفيد في فن التجويد لشيخ محمد نصر / ص ٢٨).

[*] (معجم القراءات / ج ١١، ص ١٥).

کەواتە هەر خوێندنەوەیەك کە ئەم مەرجانەی تێدا هاتە دی ئەوە پێی دەوترێ: (قراءة صحیحة) واتە: خوێندنەوەیەکی ڕاست و دروست، جا گرنگ نییە ئەم جۆرە خوێندنەوەیە لەلایەن کام لە پێشەواکانی قورئان خوێنە شارەزاکان (قراء) ە وە هاتبێ.

## سێیەم: قیرائەی شاذ *

**١) پێناسەی قیرائەی (شاذ):**

هەر خوێندنەوەیە کە یەکێ لە مەرجەکانی قیرائەی (صحیح) ی تێدا نەیەتە دی ئەوە پێی دەوترێ قیرائەی (شاذ).

(مەککی) کوڕی (ئەبی تالیب) دەفەرموێ: قیرائەتەکان دەکرێن بە سێ بەشەوە:

**یەکەم:** ئەو جۆرە خوێندنەوەیە کە ئیمڕۆ باوە لە نێو موسوڵماناندا، کە ئەمیش دەبێ سێ مەرج لەخۆ بگرێ:

١- دەبێ ئەو خوێندنەوەیە ڕاستەوخۆ لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) وەرگیرا بێت.

٢- وە وەجهێکی دروستی هەبێت لە زمانی عەرەبیدا.

٣- وە موافقی نووسینی موصحەفی عوسمانی بێت.

**دووەم:** لە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوەوە وەرگیرا بێت، وە وەجهێکی ڕاستی هەبێ لە زمانی عەرەبیدا، وە لەفزەکانی پێچەوانەی نووسینی

---

* (معجم القراءات : ج ١١ – ص ١٥).

موصحەفی عوسمانی بێ، ئەم جۆرە خوێندنەوەیەش پەسەندە، بەڵام لە ڕووی کردارەوە کاری پێ ناکرێت، ئەویش لەبەر دوو هۆ:

١- لەبەر ئەوەی ئەم جۆرە خوێندنەوەیە کۆدەنگی لەسەر نییە، وە تەنها لەلایەن کەسێکەوە گێڕراوەتەوە، کەوا بوو جۆرێ لە خوێندنەوە بۆ (قورئان) بە تەنها گێڕانەوە لە کەسێکەوە جێگیر نابێ.

٢- پێچەوانەی ئەو کۆدەنگیەیە کە پێشەوایانی قورئان خوێن لەسەری کۆبوونەتەوە.

**سێیەم:** کەسێکی بێ متمانە گێڕابێتیەوە، یاخود متمانەدارێ گێڕابێتیەوە بەڵام هیچ وەجهێکی نەبێ لە زمانی عەرەبیدا، ئەم جۆرە خوێندنەوەیەش وەرناگیرێ و کاری پێ ناکرێ ئەگەرچی موافقی نووسینی موصحەفی عوسمانیش بێت.

جا لەژێر ئەم ناونیشان و پێناسەیەدا (قیرائاتی تەفسیری) ش جێی دەبێتەوە، بۆ نموونە:

قیرائە و خوێندنەوەی (سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص) بۆ ئایەتی: ﴿وَلَهُۥٓ أُخۡتٌ﴾ (النساء:١٧٦) فقد قرأها: (**وَلَهُ أُخْتٌ مِنْ أُمّ**).

قیرائە و خوێندنەوەی (عبدالله ی کوڕی عەبباس) بۆ ئایەتی: ﴿وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٌ يَأۡخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصۡبٗا ٧٩ وَأَمَّا ٱلۡغُلَٰمُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤۡمِنَيۡنِ﴾ (الكهف:٧٩-٨٠) حيث قرأها: (**وَكانَ أَمامَهُمْ مَلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْباً * وَأَمَّا الغُلامُ فَكانَ كافِراً**).

**کۆمەڵێ لە زانایان دەفەرموون:** مەبەست لە خوێندنی قیرائەی (شاذ) تەفسیری قیرائەتە بەناوبانگەکان و ڕوونکردنەوەی واتاکانیەتی، بۆ نموونە: وەك: قیرائە و خوێندنەوەی (عائیشەی کچی ئەبوبەکری صدیق) و (حەفصەی کچی عومەر) بۆ ئایەتی: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ﴾ (البقرة:٢٣٨) کە بەم شێوەیە دەیانخوێندەوە: (**وَالصَّلاةِ الوُسْطى صَلاةُ العَصْرِ**).

وە هەروەها قیرائە و خوێندنەوەی (ئیبنو مەسعود) بۆ ئایەتی: ﴿فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا﴾ (المائدة:٣٨) کە بەم شێوەیە دەیخوێندەوە: (**فَاقْطَعُوا أَيْمانَهُما**).

وە هەروەها قیرائە و خوێندنەوەی (جابیری کوڕی عبدالله) بۆ ئایەتی: ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (النور:٣٣) کە بەم شێوەیە دەیخوێندەوە: (**مِنْ بَعْدِ إِكْراهِهِنَّ لَهُنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ**).

جا ئەم جۆرە قیرائە و خوێندنەوانە و هاوشێوەکانیان جۆرێکە لە تەفسیر بۆ ئایەتەکانی قورئان.

**٢) حوکمی قیرائەی (شاذ) لە نوێژدا:**

**١) هەندێ لە زانایان قیرائەی (شاذ) لە نوێژدا بە دروست دەزانن:**

لەبەر ئەوەی هاوەڵان و تابیعین بەم جۆرە خوێندنەوەیە قورئانیان لە نوێژدا خوێندووە، ئەمەش یەکێ لە دوو قسەی هاوەڵانی (شافیعی) و

(ئەبوحەنیفە) یە، وە یەکێ لە دوو ڕیوایەتەکان لە (مالیك) و (ئەحمەد) یشەوە هەمان بۆچوون دەسەلمێنێ.

**٢) زۆرینەی زانایان لەسەر ئەوەن کە دروست نییە:**

لەبەر ئەوەی ئەم جۆرە خوێندنەوەیە بە (متواتر) ی جێگیر نەبووە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ)، وە ئەگەر جێگریش بوو ئەوە مەنسوخە، یاخود مەنسوخە بەهۆی یەکدەنگی هاوەڵانەوە لەسەر موصحەفی عوسمانی.

**٣) هەندێ لە زانایانی تر دەڵێن:** ئەگەر هاتوو لە (قیراء) تە واجبەکاندا خوێندی وەك خوێندنی سورەتی (فاتیحە) لەگەڵ ئەوەشدا بتوانێ بە قیرائەی (صحیح) بخوێنێ ئەوە نوێژەکەی دروست نییە، بەڵام ئەگەر هاتوو لە (قیراء) تە سوننەتەکاندا خوێندی– وەك خوێندنی سورەتی دوای (فاتیحە) – ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ ناکاتەوە.

# بەشی چوارەم
# قورئان خوێنە بەناوبانگەکان

## یەکەم: حەوت قورئان خوێنە بەناوبانگەکانی ناو هاوەڵان

ئیمام (زەهەبی) لە کتێبەکەیدا (طبقات القراء) دا فەرموویەتی: قورئان خوێنە بەناوبانگەکانی ناو هاوەڵان (خوایان لێ ڕازی بێت) بریتین لە حەوت کەس:

**١- عوسمانی کوڕی عەففان.**

**٢- عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب.**

**٣- ئوبەی کوڕی کەعب.**

**٤- زەیدی کوڕی سابت.**

**٥- ئەبو دەرداء.**

**٦- عبدالله ی کوڕی مەسعود.**

**٧- ئەبو موسای ئەشعەری.**

وە فەرموویەتی: وە کۆمەڵێ لە هاوەڵانیش بە دەرس لەلای (ئوبەی کوڕی کەعب) قورئانیان خوێندووە و لێوەی فێربوون، لەوانە:

**١- ئەبوهورەیرە.**

**٢- ئیبنو عەبباس.**

**٣- عبدالله ی کوڕی سائیب.**

## دووەم: قورئان خوێنە بەناوبانگەکانی ناو تابیعین *

جا لەدوای جیلی (هاوەڵان) تابیعین و تابیعینی تابیعین جیل بەجیل و وەچە بە وەچە لەڕێی گوێ گرتن لێیان و خوێندنەوەی قورئان بۆیان ئەم زانستی قیرائەیان لێ وەرگرتوون، دەست بەدەست داویانە بەیەکتری و، خوێندکارانی ئەم بوارەیان زۆر بە باشی فێرکردووە، هەروەك چۆن خۆیان بە باشی لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) فێری بوون و دەرخیان کرد، ئاوهاش ئەوانیان فێری قورئان خوێندن کرد.

| لە شاری مەدینەی منەووەرە | لە شاری مەککەی پیرۆز |
|---|---|
| ١- سەعیدی کوڕی موسەییب | ١- عوبەیدی کوڕی عومەیر |
| ٢- عورووەی کوڕی زوبێر | ٢- عەتای کوڕی ئەبی ڕەبباح |
| ٣- سالم | ٣- تاووسی کوڕی کەیسان |
| ٤- عومەری کوڕی عبدالعزیز | ٤- موجاهیدی کوڕی جەبر |
| ٥- سولەیمانی کوڕی یەسار | ٥- عیکریمە |
| ٦- عەتای کوڕی یەسار | ٦- ابن أبي مليكة |
| ٧- موعازی کوڕی حاریس | |
| ٨- عبدالرحمن کوڕی هرمزی ئەعرەج | |
| ٩- ئیبن شیهابی زوهری | |
| ١٠- موسلیمی کوڕی جوندوب | |
| ١١- زەیدی کوڕی ئەسلەم | |

* (معجم القراءات/ ج ١١، ص ١٤) ، و (النشر/ ج ١ ، ص ٨ - ٩).

| له شاری کوفه | له شاری بەصره |
| --- | --- |
| ١- عەلقەمە | ١- عامیری کوڕی قەیس |
| ٢- مەسروقی کوڕی ئەجدەع | ٢- أبو العالية |
| ٣- عوبەیدە | ٣- ئەبو ڕەجاء |
| ٤- عەمری کوڕی شەرحەبیل | ٤- نەصری کوڕی عاصم |
| ٥- حاریسی کوڕی قەیس | ٥- یەحیای کوڕی یەعمور |
| ٦- ڕەبیعی کوڕی خوثەیم | ٦- موعاز |
| ٧- عەمری کوڕی مەیموون | ٧- جابری کوڕی زەید |
| ٨- ئەبو عبدالرحمن سوللەمی | ٨- حەسەنی بەصری |
| ٩- ئەسوەدی کوڕی یەزید | ٩- ابن سیرین |
| ١٠- عوبەیدی کوڕی نەضلە | ١٠- قەتادە |
| ١١- ئەبو زەرعەی کوڕی عەمری کوڕی جەریر | ١١- عبداللە کوڕی ئەبی ئیسحاقی حەضرەمی |
| ١٢- وزری کوڕی حەبیش | |
| ١٣- ئیبراهیمی نەخەعی | |
| ١٤- سەعیدی کوڕی جوبەیر | |
| ١٥- شەعبی | |

| له وڵاتی شام |
| --- |
| ١- موغەیرەی کوڕی ئەبی شیهابی مەخزومی کەلە پێشەوا (عوسمانی کوڕی عەففان) ی وەرگرتووە |
| ٢- خولەید یان حولەیدی کوڕی سەعد کەلە (ئەبی دەرداء) ی وەرگرتووە |
| |

## سێیەم: چواردە قورئان خوێنەکان و ڕیوایەتەکانیان

### ١) حەوت قورئان خوێنە بە ناوبانگەکان

ناوی ئەو حەوت قورئان خوێنە بە ناوبانگانەی کە خوێندنەکەیان موتەواتیرە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) و، وە ئیجماعی ئوممەتی لەسەرە بریتیە لە:

١- **(ئیبنو عامیر) ی دیمەشقی:** ناوی تەواوی: (عبدالله) ی کوڕی (عامر) ی (یەزید) ی کوڕی (تەمیم) ی کوڕی (ڕەبیعە) ی یەحصەبیە – ساڵی (٨) ی هیجری لە دایك بووە ، وە لە ساڵی (١١٨) ی کۆچی لە ڕۆژی (عاشورا) دا لە (دیمەشق) کۆچی دوایی کردووە، یەکێکە لە تابیعیە بەڕێزەکان و پێشەوایەکی گەورە بووە .

هەم لەسەردەمی (عومەری کوڕی عبدالعزیز) و هەم لەسەردەمی پێش ئەویشدا بۆ ماوەی چەند ساڵێك لە مزگەوتی (ئەمەویەکان) بەرنوێژی بۆ موسوڵمانان کردووە ، لە کاتێکدا کە (عومەری کوڕی عبدالعزیز) خەلیفە بوو نوێژی لە پشت سەریەوە دەکرد ، وە لەسەردەمی (وەلیدی کوڕی عبدالملك) دا قازی (دیمەشق) بووە.

**لەوانەی لێیان گێڕاوەتەوە بریتیە لە:**

**أ- هیشامی کوڕی عەمماری کوڕی نەصیری کوڕی مەیسەرەی سەلەمی دیمەشقی بووە:** کە ساڵی (١٥٣) ی کۆچی لە دایك بووە ، وە لە ساڵی (٢٤٥) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە ، ئەم پیاوە بەڕێزە زانا و موفتی و موحەدیسی هەموو خەڵکی (دیمەشق) بووە.

**ب- (ابن ذكوان):** ناوی تەواوی: ئەبو عەمر (عبدالله) ی کوڕی (ئەحمەد) ی فەهری قورەیشی دیمەشقی یە، لە ڕۆژی (عاشورا) دا لە ساڵی (١٨٧) ی کۆچی لە دایك بووە، وە لە مانگی (شەوال) ی ساڵی (٢٤٢) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە، ئەم پیاوە بەڕێزەیش لە سەردەمی خۆیدا شەیخی قورئان خوێنەکانی (شام) بووە و، وە پێش نوێژی مزگەوتی (ئەمەویەکان) یش بووە.

**٢- (عبدالله ی کوڕی کەثیر) ی مەککی:** لە بنەڕەتیشدا فارسە، قورئان خوێنی (مەککە) بووە، لە دایك بووی ساڵی (٤٥) ی کۆچیە، و لە ساڵی (١٢٠) ی کۆچی هەر لە شاری (مەککە) کۆچی دوایی کردووە.

هەتا لە ژیاندا بوو لە قورئان خوێندنا پێشەوای خەڵکی مەککە بوو، وە زانایەکی زمان پاراوو بە توانا بوو، وە بە خزمەتی ئەم هاوەڵانەی پێغەمبەریش (ﷺ) گەیشتبوو: (عبدالله ی کوڕی زوبێر)، (ئەبوئەییوبی ئەنصاری)، (ئەنەسی کوڕی مالیك) (خوایان لێ ڕازی بێت).

**لەوانەی لێیان گێڕاوەتەوە بریتیە لە:**

**أ- (البزي):** ناوی تەواوی: (ئەحمەد) ی کوڕی (محمد) ی کوڕی (عبدالله) یە، لە بنەڕەتدا فارسە، مەککی بە ناوبانگە، لە ساڵی (١٧٠) ی کۆچی لە دایك بووە و، وە لە ساڵی (٢٥٠) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

بانگ بێژی مزگەوتی (حەرام) بووە، وە لە ژیانی ئەمدا مەشایخی قورئان خوێن لە مەککە دەگاتە کۆتا.

**ب- (قنبل):** ناوی تەواوی: (محمد) ی کوڕی (عبدالرحمن) ی مەخزومیە، نازناوی (قونبولە)، مەککی یە، لە ساڵی (١٩٥) ی کۆچی لە دایك بووە و، وە لە ساڵی (٢٩١) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە، وە لە ژیانی ئەم بەڕێزەدا مەشایخی قورئان خوێن لە حیجاز دەگاتە کۆتا.

**٣- (عاصم) ی کوڕی (أبی النجود) ئەسدیە:** لە ساڵی (١٢٧) ی کۆچیدا لە (کوفە) کۆچی دوایی کردووە، لە دوای (ئەبو عبدالرحمن) ی سوللەمیەوە دوا کەسی مەشایخی قورئان خوێنەکانە لە کوفە، وە کەسێکی زۆر دەنگ خۆش بووە، وە پیاوێکی صالح و خاوەن متمانە بووە.

ئەم (عاصمی کوفی) یە لەسەر دەستی (زەری کوڕی حوبەیش) و (ئەبی عبدالرحمن سوللەمی) قورئانیان خوێندووە و قیرائەتیان وەرگرتووە، ئەوانیش لە خزمەتی (ئیبنو مەسعود) و (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) و (عوسمانی کوڕی عەنفان) و (ئوبەی کوڕی کەعب) و (زەیدی کوڕی ثابت) دا قورئان فێربوون و قیرائەتیان وەرگرتووە.

**لەوانەی لێیان گێڕاوەتەوە بریتیە لە:**

**أ- ئەبو بەکر (شوعبە) ی کوڕی (عەیاش) ی ئەسدی کوفییە:** لە ساڵی (٩٥) ی کۆچیدا لە دایك بووە، وە لە ساڵی (١٩٣) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە، ئەم پیاوە بەڕێزە پێشەوا و زانایەکی گەورە بووە لە پێشەواکانی ئەهلی سوننە.

**ب- (حەفص) ی کوڕی (سولەیمان) ی کوڕی (موغەیرە) ی کوڕی (ئەبوداود) ی ئەسدی کوفیە:** لە ساڵی (٩٠) ی کۆچیدا لە دایك بووە، وە لە ساڵی (١٨٠) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە، (حەفص) زاناترینی خەڵکی بووە بە قیرائەی (عاصم) ، وە ڕاسترین گێڕانەوە کە لە (عاصم) ە وە گێڕدرابێتەوە گێڕانەوەکەی (حەفص) ە.

**٤- (ئەبو عەمری کوڕی عەلاء) :** ناوی تەواوی: (زەببان) ی کوڕی (عەلائی) تەمیمی بەصری یە- لە ساڵی (٦٨) ی کۆچی لە دایك بووە و، وە لە ساڵی (١٥٤) ی کۆچی لە (بەصرە) کۆچی دوایی کردووە.

لە کات و سەردەمی خۆیدا شارەزاترین کەس بووە بە قورئان و زمانی عەرەبی لەگەڵ ئەوەشدا کەسێکی ڕاستگۆ و متمانەدار و ئەمین و ديندار بووە.

**لەوانەی لێیان گێڕاوەتەوە بریتیە لە:**

**أ- (حەفص الدوري)** *: ناوی تەواوی: (ئیبنوعومەر) ی کوڕی (عبدالعزین) ی کوڕی (صوهبان) ی ئەزدی بەغدادی نەحویە، نابینا بووە، وە لە ساڵی (٢٤٦) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

لە سەردەمی خۆیدا شەیخی هەموو قورئان خوێنەکان بووە و، وە یەکەم کەس بووە کە قیرائاتە جۆراو جۆرەکانی کۆکردۆتەوە، وە هەندێ جار بە ناوی (دوری أبو عمر) ناوی دێ ، ئەوەش بۆ ئەوەی کە گێڕانەوەکەی ئەم لە گێڕانەوەکەی (کەسائی) جیا بکرێتەوە.

**ب- (السوسي):** ناوی تەواوی: ئەبو شوعەیب (صالەح) ی کوڕی (زیاد) ی کوڕی (عبدالله) ی کوڕی (ئیسماعیل) ە، لە ساڵی (٢٦١) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە، نزیکەی (٩٠) ساڵ ژیاوە، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە نزیکەی ساڵی (١٧١) ی کۆچی لە دایك بووە.

**٥- (حەمزە) ئەبو عەمارە:** ناوی تەواوی: (حەمزە) ی کوڕی (حەبیب) ی زەییاتە- ساڵی (٨٠) ی کۆچی لە دایك بووە و، ساڵی (١٥٦) ی کۆچیش لە (حەلوان) کۆچی دوایی کردووە، لە کوفە لە دوای (عاصم) و (ئەعمەش) پێشەوای خەڵکی بووە لە قورئان خوێندنا.

پیاوێکی متمانەدار و حوججە بووە، وە شارەزا و زانا بووە لە زانستی فەرائیز و فەرموودەدا، وە ڕۆنی زەیتی دەهێنا لە عێراقەوە بۆ حەلوان، وە پەنیر و گوێزیشی لە حەلوانەوە دەهێنا بۆ کوفە، وە فەرموویەتی: هیچ

* (الدور) : ناوچەیەکە لە شاری (بەغداد).

پیتێکم لە قورئانی پیرۆز نەخوێندۆتەوە هەتا ئەسەرێکم لەسەری نەبینی بێ.

**لەوانەی لێیان گێڕاوەتەوە بریتیە لە:**

**أ- (خەلف) ی کوڕی (هیشام)**: نازناوەکەی: ئەبو موحەممەدی ئەسدی بەزاری بەغدادی یە، لە ساڵی (١٥٠) ی کۆچیدا لە دایك بووە، وە لە ساڵی (٢٢٩) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

**ب- (خەللاد)**: ناوی تەواوی: ئەبو عیسا (خەللاد) ی کوڕی (خالید) ی شەیبانیە، لە ساڵی (٢٢٠) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە، لە بنەڕەتدا خەڵکی کوفەیە.

**٦- (نافیعی کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی ئەبونوعەیم یا (ئەبو ڕوەیەم) مەدەنی**: نزیکەی ساڵی (٧٠) ی کۆچی لە دایك بووە، وە لە ساڵی (١٦٩) ی کۆچیدا لە (مەدینە) کۆچی دوایی کردووە ، لە بنەڕەتدا خەڵکی (ئەصبەهان) ە.

قورئان خوێنی شاری مەدینەی پیرۆز بووە، وە لە ژێر دەستی حەفتا (٧٠) تابیعینی بەڕێزدا قورئانی خوێندووە.

**لەوانەی لێیان گێڕاوەتەوە بریتیە لە:**

**أ- (قالون)**: ناوی تەواوی: (عیسا) ی کوڕی (مینا) یە، لە ساڵی (١٢٠) ی کۆچیدا لە دایك بووە ، وە لە ساڵی (٢٢٠) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

له ژێر دەستی (نافیع) دا قورئانی خوێندووە، وە وتراویشە: کە (نافیع) ئەم نازناوەی (قالون) ی لێ ناوە، ئەویش لەبەر زۆر لێهاتوویی لە قورئان خوێندنا ئەم نازناوەی داوەتێ.

**ب- (وەرش):** ناوی تەواوی: (عوسمان) ی کوڕی (سەعید) ی میصریە، لە ساڵی (١١٠) ی کۆچیدا لە دایك بووە، وە لە ساڵی (١٩٧) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

لە ساڵی (١٥٥) ی کۆچیدا لەسەردەستی (نافیع) قورئانی خوێندووە و لە پاشا گەڕاوەتەوە بۆ وڵاتی (میصر)، نازناوی (وەرش) ی بۆ لێنراوە چونکە کەسێکی زۆر سپی پێست بووە.

**٧- (کەسائی):** ناوی تەواوی: ئەبو حەسەن (عەلی) کوڕی (حەمزە) یە، لە بنەڕەتدا فارسە، قورئان خوێنی ئەهلی کوفە بووە، لە ساڵی (١١٩) ی کۆچیدا لە دایك بووە، وە لە ساڵی (١٨٩) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

لە سەردەمی خۆیدا پێشەوای قورئان خوێنان بووە، وە زانایەکی پسپۆڕ بووە لە بواری (نەحو) و کەلیماتی (غەریب) دا.

**لەوانەی لێیان گێڕاوەتەوە بریتیە لە:**

**أ- (ئەبو حاریس):** ناوی تەواوی: (لەیث) ی کوڕی (خالید) ی بەغدادییە، لە ساڵی (٢٤٠) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

**ب- (الدوري)*** : ناوی تەواوی: (ئیبنوعومەر) ی کوڕی (عبدالعزیز) ی کوڕی (صوهبان) ی ئەزدی بەغدادی نەحویە، نابینا بووە، وە لە ساڵی (٢٤٦) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

لە سەردەمی خۆیدا شەیخی هەموو قورئان خوێنەکان بووە و، وە یەکەم کەس بووە کە قیرائاتە جۆراو جۆرەکانی کۆکردۆتەوە، وە هەندێ جار بە ناوی (دوری أبو عمر) ناوی دێ، ئەوەش بۆ ئەوەی کە گێڕانەوەکەی ئەم لە گێڕانەوەکەی (کەسائی) جیا بکرێتەوە.

**٢ ) سێ قورئان خوێنەکەی تر کە لەگەڵ حەوتەکەدا دەبنە دە قورئان خوێن**

**٨- (ئەبو جەعفەر)**: ناوی تەواوی: (یەزید) ی کوڕی (قەعقاع) ی مەخزومی یە، لە ساڵی (١٣٠) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە، وە یەکێکە لە تابیعین و، شەیخی (نافیع) یشە.

**لەوانەی لێیان گێڕاوەتەوە بریتیە لە :**

**أ- (ئەبوحاریسی مەدەنی)**: ناوی تەواوی: (عیسا) ی کوڕی (وەردان) ی مەدەنیە ، لە ساڵی (١٦٠) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

**ب- (ابن جماز)**: ناوی تەواوی: (سولەیمان) ی کوڕی (موسلیم) ی کوڕی (جمان) ی مەدەنی یە، لە ساڵی (١٧٠) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

---

* (الدور) : ناوچەیەکە لە شاری (بەغداد).

**٩- (یەعقوب) ی کوڕی (ئیسحاق) ی کـوڕی (زەیـد) ی کـوڕی (عبـدالله) ی کوڕی (ئیسحاق) ی حەضرەمی بەصری یە:** کە نازناوەکەی (أبو محمد) ە ، لە ساڵی (١١٧) ی کۆچی لە دایك بووە، وە لە سـاڵی (٢٠٥) ی کۆچیدا کۆچـی دوایی کردووە، کاتێ کە لە ژیاندا بوو پێش نوێژی مزگەوتی (بەصرە) بوو.

**لەوانەی لێیان گێڕاوەتەوە بریتیە لە:**

**أ- (ڕوەیس):** ناوی تەواوی: ئـەبو عبـدالله (محمـد) ی کـوڕی (متـەوەکیل) ی بەصریە ، لە ساڵی (٢٣٨) ی کۆچیدا لە (بەصرە) کۆچی دوایی کردووە.

**ب- (ڕەوح):** ناوی تەواوی: ئـەبو حەسـەن (ڕەوح) ی کـوڕی (عبـدالمؤمن) ی بەصـری یـە، لـە سـاڵی (٢٣٤) ی کۆچـیدا کۆچـی دوایـی کـردووە، پێـشەوا (بوخاری) لە (صحیح) ە کەیدا فەرموودەی لێ گێڕاوەتەوە.

**١٠- (خەلف) ی کوڕی (هیشام):** نازناوەکەی: ئەبو محمـدی ئەسـدی بـەزاری بەغدادی یە، لە ساڵی (١٥٠) ی کۆچیدا لە دایك بووە، وە لە ساڵی (٢٢٩) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە .

**لەوانەی لێیان گێڕاوەتەوە بریتیە لە:**

**أ- (ئەبو یـەعقوب):** نـاوی تـەواوی (ئیـسحاق) ی کـوڕی (ئیـبراهیم) ی کـوڕی (عوسمان) ی مروزی پاشان بەغدادیـە، لـە سـاڵی (٢٨٦) ی کۆچـیدا کۆچـی دوایی کردووە ، ناسراوە بە (ئیسحاقی وەرراق).

**ب- (ئیدریس) ی کوڕی (عبدالکریم) ی حەددادی بەغدادیە:** لـە سـاڵی (١٨٩) ی کۆچـی لـە دایـك بـووە، وە لـە سـاڵی (٢٩٢) ی کۆچـیدا کۆچـی دوایـی کردووە، کەسێکی متمانەدارە.

**٣) چوار قورئـان خوێنەکەی تر کە بە دە کەوە دەبنە چواردە قورئان خوێن** *

**١١- (ابن محیصن)*:** ناوی تەواوی: (محمد) ی کوڕی (عبـدالرحمن) ی کـوڕی (موحەیصین) ی سەهمی یە، لە سـاڵی (١٢٣) ی کۆچـیدا لـە شـاری مەککـە کۆچـی دوایـی کـردووە، کەسـێکی متمانـەدارە، وە قورئـان خـوێنی خـەڵکی مەککە بووە، وە زاناش بووە بە فەرموودە.

**لەوانەی لێیان گێڕاوەتەوە بریتیە لە:**

**أ- (البزي):** ناوی تەواوی: (ئەحمـەد) ی کـوڕی (محمـد) ی کـوڕی (عبـدالله) یە، لە بنەڕەتدا فارسە، مەککی بە ناوبانگـە، لـە سـاڵی (١٧٠) ی کۆچـی لـە دایك بووە و، وە لە ساڵی (٢٥٠) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

بانگبێژی مزگـەوتی (حـەرام) بـووە، وە لـە ژیـانی ئەمـدا مەشـایخی قورئـان خوێن لە مەککە دەگاتە کۆتا.

**ب- (ابـن شـنبوذ)*:** نـاوی تـەواوی: (محمـد) ی کـوڕی (ئەحمـەد) ی کـوڕی (ئەییوب) ی کوڕی (صەڵت) ی بەغدادیە، پیاوێکی تا بڵێی صـاڵح بـووە، لـە

---

* (الإتحاف : ٧).

* بڕوانە (غایة النهایة/ ج ٢، ص ١٦٧).

* بڕوانە (غایة النهایة / ج ٢، ص ٥٢).

قیرائەتی قورئانا لە (ابن مجاهد) شارەزاتر بووە، لە ساڵی (٣٢٨) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

**١٢- (الیزیدی)*** : ناوی تەواوی: (یەحیا) ی کوڕی (موبارەك) ی کوڕی (موغەیرە) ی بەصری یە، لە ساڵی (١٢٨) ی کۆچی لە دایك بووە، وە لە ساڵی (٢٠٢) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.
ئەم پیاوە زانایەکی شارەزا بووە لە قورئان خوێندن و زانستی نەحودا، وە زمانی عەرەبیشی لەلای (ئەبوعەمر) ی کوڕی (عەلاء) فێر بووە.

**لەوانەی لێیان گێڕاوەتەوە بریتیە لە:**

**أ- (ئەبو ئەییوب)*** : ناوی تەواوی: (سولەیمان) ی کوڕی (حەکەم) ی بەصریە، (حافظ) و (متمانەدار) ە، لە ساڵی (٢٣٥) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

**ب- (ابن فرح)*** : ناوی تەواوی: (ئەحمەد) ی کوڕی (فەرەح) ی بەغدادیە، ناسراو بە (ئەبوجەعفەری نابینا)، لە ساڵی (٣٠٣) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

**١٣- (حەسەنی بەصری)*** : ناوی تەواوی: (حەسەن) ی کوڕی (ئەبو حەسەن) ی کوڕی (یەسار) ی بەصریە ، لە ساڵی (٢١) ی کۆچی لە دایك بووە، وە لە ساڵی (١١٠) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

---

* (غاية النهاية / ج ٢، ص ٣٧٥).

* (غاية النهاية / ج ١، ص ٣١٢).

* (غاية النهاية / ج ١، ص ٩٥).

به خزمەتی پێشەوا (عوسمان) گەیشتووە، وە شەیخی (بەصرە) بووە، وە (ئەبوعەمر) ی کوڕی (عەلاء) و (ئەنەس) ی کوڕی (مالیك) کاتێ لە ژیاندا بووە ستایشیان کردووە.

**لەوانەی لێیان گێڕاوەتەوە بریتیە لە:**

أ- **(ئەبونەعیم) ی بەغدادی***: ناوی تەواوی: (شوجاع) ی کوڕی (ئەبونەصر) ی بەڵخی یە، لە ساڵی (١٢٠) ی کۆچی لە (بەڵخ) لە دایك بووە، وە لە ساڵی (١٩٠) ی کۆچیدا لە (بەغداد) کۆچی دوایی کردووە.

ب- **(الدوري)***: ناوی تەواوی: (ئیبنوعومەر) ی کوڕی (عبدالعزیز) ی کوڕی (صوهبان) ی ئەزدی بەغدادی نەحویە، نابینا بووە، وە لە ساڵی (٢٤٦) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

لە سەردەمی خۆیدا شەیخی هەموو قورئان خوێنەکان بووە و، وە یەکەم کەس بووە کە قیرائاتە جۆراو جۆرەکانی کۆکردۆتەوە، وە هەندێ جار بە ناوی (دوری أبو عمر) ناوی دێ، ئەوەش بۆ ئەوەی کە گێڕانەوەکەی ئەم لە گێڕانەوەکەی (کەسائی) جیا بکرێتەوە.

١٤- **(ئەعمەش)***: ناوی تەواوی: (سولەیمان) ی کوڕی (مەهران) ی کوفی یە، لە ساڵی (٦٠) ی کۆچی لە دایك بووە، وە لە ساڵی (١٤٨) ی کۆچیدا کۆچی

---

* (غاية النهاية / ج ١، ص ٢٣٥).
* (غاية النهاية / ج ١، ص ٣٢٤).
* (**الدور**): ناوچەیەکە لە شاری (بەغداد).
* (غاية النهاية / ج ١، ص ٣١٥).

دوایی کردووه، پیاوێکی زۆر شارەزا بوو لە قورئان خوێندنا، وە حافظی فەرمووده بوو، وە زاناش بوو بە مەسائیلی فەرائیز.

**لەوانەی لێیان گێڕاوەتەوە بریتیە لە:**

**أ- (حەسەن) ی کوڕی (سەعید) ی موطەوەعی***: لە ساڵی (٢٧٠) ی کۆچی لە دایك بووه، وە لە ساڵی (٣٧١) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووه.

**ب- (الشنبوذي)***: ناوی تەواوی: ئەبو فەرەج (محمد) ی کوڕی (ئەحمەد) ی کوڕی (ئیبراهیم) ی شەطوی، بەغدادی یە، لە ساڵی (٣٠٠) ی کۆچی لە دایك بووه، وە لە ساڵی (٣٨٨) ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووه.

---

* (غاية النهاية / ج ١، ص ٢١٢).

* (غاية النهاية / ج ٢، ص ٥٠).

# بەشی پێنجەم

## ئەو کتێبانەی لە بواری قیرائاتی سەبعەدا دانراون

یەکەم زانایەك کە ئەم زانستەی لە دووتوێی کتێبێکدا کۆکردەوە، لە سەدەی سێی (هیجری) دا، ئیمامی گەورە (ئەبو عوبەیدی قاسمی کوڕی سەلام) بووە، کە ناوی لێ ناوە: (کتاب القراءات).

**وە وتراوە:** یەکەم زانایەك کە ئەم زانستەی لە دووتوێی کتێبێکدا کۆکردۆتەوە (حەفصی کوڕی عومەری دووری) بووە.

وە لە سەدەی چوارەمی هیجریدا یەکەم زانایەك کە هەڵسا بە کۆکردنەوەی (قیرائاتی سەبعە) لە دووتوێی کتێبێکدا حافظ (ئەبوبەکری کوڕی موجاهیدی بەغدادی) بووە، وە لە ساڵی (٣٢٤) ی هیجریدا کۆچی دوایی کردووە.

وە لە سەدەی پێنجەمی هیجریدا یەکەم زانایەك کە هەڵسا بە کۆکردنەوەی (قیرائاتی سەبعە) لە دووتوێی کتێبێکدا پێشەوای حافظ (ئەبوعەمر عوسمانی کوڕی سەعیدی دانی) بووە، کە ناوی لێ ناوە: (التيسير في القراءات السبع).

وە هەر لە سەدەی پێنجەمی هیجریدا زانایەکی تر لەم بوارەدات ناوبانگی پەیاکرد کە هەڵسا بە نووسینەوە و کۆکردنەوەی (قیرائاتی سەبعە) لە دووتوێی کتێبێکدا پێشەوا (مەککی کوڕی ئەبی تالیبی قەیسی قەیرەوانی) بووە.

وە لە سەدەی شەشەمی هیجریدا یەکەم زانایەك کە لەم زانستەدا کتێبی داناو ناوبانگی پەیاکرد پێشەوا (ئەبو قاسمی کوڕی فیرەی کوڕی خەلفی کوڕی ئەحمەدی ڕەعینی شاطبی ئەندەلووسی) بووە، کە ناوی لێ ناوە: (حرز الأماني ووجه التهاني)، کە هەموو (قیرائاتی سەبعەی موتەواتیر) ی لە ناو (١١٧٣) بەیتە شیعردا داڕشتووە و کۆیکردۆتەوە، وە لە ساڵی (٥٩٠) ی هیجریدا کۆچی دوایی کردووە.

لەپاش ئەویش شێخی قورئان خوێنان پەیا بوو کە دەورێکی باڵای هەبوو لە بڵاوکردنەوەی ئەم زانستەدا بە جیهانی ئیسلامیدا ، کە ئەویش زانای پایە بەرز (موحەممەدی کوڕی جەزریی شافیعی) یە، جا لەم بوارەدا کتێبی زۆری داناوە بەناوبانگ ترینیان برتیی یە لە: (النشر في القراءات العشر).

**(ئیبن عاشور) لە تەفسیرەکەیدا (التحرير والتنوير) دا وتوویەتی:** ئەو قیرائاتانەی کە حاڵی حازر لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا دەخوێندرێ و پەیڕەوی لێ دەکرێ، بەم شێوەیەی لای خوارەوەیە:

**١) قیرائەتی (نافیع) بە ڕیوایەتی (قالون):**

لە هەندێ ناوچەی وڵاتی (تونس) و (میصر) و، وڵاتی (لیبیا) دەخوێنرێ.

**٢) قیرائەتی (نافیع) بە ڕیوایەتی (وەرش):**

لە هەندێ ناوچەی وڵاتی (تونس) و (میصر) و، وڵاتی (جەزائیر) و ، سەرجەم وڵاتی (مەغریبی ئەقصا) و، هەروەها وڵاتی (سودان) یش دەخوێنرێ.

**٣) قیرائەتی (عاصم) بە ڕیوایەتی (حەفص):**

لە سەرجەم وڵاتەکانی ڕۆژهەڵاتدا دەخوێنرێ و پەیڕەوی لێ دەکرێ، وە هەروەها زۆربەی وڵاتی (میصر) و، (هندستان) و، (پاکستان) و، (ئەفغانستان) و، (تورکیا) دا دەخوێنرێ.

**٤) قیرائەتی (ئەبی عەمری بەصری) بە ڕیوایەتی (الدوري) یا (السوسي):**

لە وڵاتی (سودان) دەخوێنرێ.

کەواتە هەر قیرائەتێ لەو دە قیرائەتە ناوی یەکێ لەو پێشەوایانەی بدرێتە پاڵ، پێی دەوترێ: (قیرائەت)، وە هەر یەکێ لە گێڕەرەوەی ئەو قیرائەتانە ناوی ڕاویەکەی بدرێتە پاڵ، پێی دەوترێ: (ڕیوایەت)، بۆ نموونە: قیرائەی (عاصم) بە ڕیوایەتی (حەفص)، یا قیرائەی (نافیع) بە ڕیوایەتی (وەرش).

## بەشی شەشەم

## ئاداب و دەستوورەکانی قورئان خوێندن

### یەکەم: کاتە هەڵبژێرراوەکان بۆ قورئان خوێندن

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لەم بارەوە لە (أذكار) دا فەرموویەتی*:

ئەوە بزانە کە چاکترین کات بۆ خوێندنی قورئان ئەوەیە کەوا لەناو نوێژدا بێت.

وە ڕێڕەوی پێشەوا (شافیعی) و کەسانی تر (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ) لەم بارەوە ئەوەیە کە: مانەوەی زۆر لە نوێژدا بە هۆی قورئان خوێندنەوە چاکترە بە لایانەوە لە درێژکردنەوەی سوجدە و، وە جگە لە سوجدەش.

هەروەها دەفەرموێ: خوێندنی قورئان جگە لە کاتی نوێژ، چاکترین کات شەوە، وە نیوەی کۆتایی یەکەی چاکترە لە سەرەتاکەی، وە خوێندنی قورئان لە نێوان (مەغریب) و (عیشا) دا مەحبوب و خۆشەویستە.

بەڵام خوێندنی قورئان لە ڕۆژدا، چاکترین کاتی لە دوای نوێژی بەیانیەوەیە، وە هیچ کەراهەتێکیش نییە لە خوێندنی قورئان لە هەر کاتێ لە کاتەکانی شەوو ڕۆژدا ، تەنانەت ئەو کاتانەش کە قەدەغە کراوە لە نوێژکردن تێیدا.

وە ئەوەی کە (ئیبنو ئەبی داود) گێڕاویەتەوە لە (موعان) ی کوڕی (ڕیفاع) ە وە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) ئەویش لە (مەشایخەکان) یەوە: کەوا بە

---

* (نيل الأوطار بتخريج أحاديث كتاب الأذكار / ج ١، ص ٢٦٢ – ٢٦٣).

کەراهەتیان زانیوە قورئـان خوێنـدن لـە دوای (عەصـر) ە وە، وە وتوویانـە:
ئەو کاتە کاتی دیراسە کردنی جوولەکەکانە.

ئـا ئـەوە بـە هـیچ شـێوەیەك پەسـەند نیـە و، وە هـیچ بناغـەیـەکی ڕاسـت و دروستیشی نیە.

وە ئەوەی کەوا هەڵبـژێرراوە لـە ڕۆژەکانـدا بریتـی یـە لـە: ڕۆژی جومعـە و، ڕۆژی دوو شەممە و، ڕۆژی پێنج شەممە و، ڕۆژی عەرەفە.

وە لە دە ڕۆژەکاندا بریتی یە لە: دە ڕۆژی یەکەم لـە مـانگی (ذي الحجـة) و، دە ڕۆژی کۆتایی لە مانگی (ڕەمەزان).

وە لە مانگەکاندا بریتی یە لە: مانگی ڕەمەزان.

## دووەم: ئادابەکانی قورئان خوێندن

پێش دەست کردن بە قورئان خوێندن سوننەتە چەند شتێ ئـەنجام بـدرێت، لەوانە:

**١) تارەت گرتن و خۆ خاڵی کردنەوە لەو شتانەی کـە دەبنـە هـۆی دەسـتنوێژ شکاندن:**

چونکە کاتێ مرۆڤ پێویستی سەرئاوی هەبێ ئەوە بێگومان هەتا ماوەیـەکی کـەم دەتوانـێ خـۆی بگـرێ و دەسـتنوێژەکەی نەشـکێنێ، بۆیـە وا چـاکە لەپێشا خۆی بشکێنێ بزانـێ پێویـستی بەسـەر ئـاو هەیـە یـان نـا؟ ئەگـەرنا دەستنوێژ بگرێ و بچێ بەدەم قورئان خوێندنەکەیەوە.

**٢) دەستنوێژ گرتن:**

لە (موهاجیر) کوڕی (قنفذ) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( **أنه أتى النبي (ﷺ) وهو يبول ، فسلم عليه ، فلم يرد عليه حتى توضأ، ثم اعتذر إليه ، فقال: إني كرهت أن أذكر الله عز وجل إلا على طهر، أو قال: على طهارة** ))[16]

واتە: پیاوێك تێ پەڕی بە لای پێغەمبەردا (ﷺ) لە کاتێکدا میزی دەکرد، جا کابرا سەلامی کرد لە پێغەمبەر (ﷺ)، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) هیچ وەڵامی کابرای نەدایەوە هەتا دەستنوێژی گرت، پاشان عوزر خوایی بۆ کابرا هێنایەوە و، ئنجا فەرمووی: بەڕاستی پێم باش نەبوو کەوا ناوی خوا بهێنم و یادی بکەم مەگەر لە کاتی پاکێتی و دەستنوێژدا نەبێ.

**٣) ڕەچاوکردنی پاکوخاوێنی جل و بەرگ و ئەو شوێنەی لێی دادەنیشی:**

لە (ئەبو مالیك) ی ئەشعەرییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( **الطهور شطر الإيمان** ، ..))[17] واتە: پاك و خاوێنی نیوەی باوەڕە.

---

[16] **صحیح** – (ئەبوداود) لە کتابی (الطهارة)، بابی: (أيرد السلام وهو يبول) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٧)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الطهارة)، بابی: (السلام على من يبول) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٧)، هەروەها (ابن ماجە) لە کتابی (الطهارة وسننها)، بابی: (الرجل يسلم عليه وهو يبول) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٥٠).

[17] **صحیح** – (موسلیم) لە کتابی (الطهارة)، بابی: (فضل الوضوء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٣٣)، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الدعوات)، بابی: (٨٦) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٥١٧).

**٤) ڕووکردنە قیبلە:**

لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( **لكل شيء سيدا ، وإن سيد المجالس قبالة القبلة** ))[18]

واتە : هەموو شتێ گەورەوسەروەرێکی هەیە، گەورە و سەروەری مەجلیس و کۆڕەکانیش ڕووکردنە قیبلە و ڕووگەیە.

**٥) دانانی قورئانەکە لەسەر شتێ یا لە باوەشدا بێ یا بەدەستەوە بگیرێ.**

**٦) کاتێ دەگەیت بە هەر ئایەتێ کە باس لە تەسبیحاتی خوا دەکا (سبحان الله) بکە، وە کاتێ دەگەیت بە هەر ئایەتێ کە باس لە ڕەحمەتی خوا دەکات، ئەوە داوای ڕەحمەت و میهرەبانی و بەهەشت لەخوای گەورە بکە، وە کاتێکیش دەگەیت بە هەر ئایەتێ کە باس لە سزاو عەزابی خوایی دەکات، ئەوە پەنا بگرە بەخوا لە سزای خوایی و ئاگری دۆزەخ:**

لە (حوزەیفە) ی کوڕی (یەمان) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( **صليت مع النبي (ﷺ) ذات ليلة ، فافتتح البقرة، فقلت: يركع عند المائة، ثم مضى، فقلت: يصلي بها في ركعة ، فمضى، فقلت: يركع بها، ثم افتتح النساء ، فقرأها، ثم افتتح آل عمران ، فقرأها، يقرأ مترسلا ، إذا مر بآية فيها تسبيح سبح، وإذا مر بسؤال سأل، وإذا مر بتعوذ تعوذ، ثم ركع ، فجعل يقول: سبحان ربي العظيم ، فكان ركوعه**

---

[18] **حسن** - (تەبەرانی) لە (المعجم الأوسط) دا ، بابی: (الألف: من اسمه إبراهيم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٣٩٣) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (صحيح الترغيب والترهيب/ ج ٣، ح ٣٠٨٥) ، و (سلسلة الأحاديث الصحيحة/ ج ٦، ص ٣٠٠، ح ٢٦٤٥) دا فەرموویەتی: (حسن) ە.

**نحوا من قيامه، ثم قال: سمع الله لمن حمده، ثم قام طويلا قريبا مما ركع، ثم سجد، فقال: سبحان ربي الأعلى، فكان سجوده قريبا من قيامه))**[19]

واتـه : شـەوێك لەگـەڵ پێغەمبـەردا (ﷺ) نوێـژم دەكـرد ، دوای خوێنـدنی سورەتی (فاتیحە) دەستی كرد بـە خوێنـدنی سورەتی (البقرة) – لـە دڵـی خۆمـدا– وتم: صـەد ئایـەت دەخوێنێـت و دەچێتە ڕكوعـەوە، بـەڵام هـەر بەردەوام بوو، وتم: ئەو سورەتە لـە ڕكـاتی یەكەمـدا تـەواو دەكـات ، بینـیم كاتـێ ئـەو سـورەتەی تـەواو كـرد دەسـتی كـرد بـە خوێنـدنی سـورەتی (آل عمران)، ئەویشی تەواو كردو دەستی كـرد بـە خوێنـدنی سـورەتی (النـساء) ئەویـشی تـەواو كـرد هـەر لـەو ڕكاتـەدا، لەسـەر دەیخوێنـد، كاتـێ بەسـەر ئایەتێكـدا تێدەپـەڕی باسـی پـاك و بێگـەردی پـەروەردگاری دەكـرد دەیفـەرموو: (سـبحان الله)، كاتـێ بەسـەر ئایـەتێكی پاڕانـەوەدا تێدەپـەڕی ئەویش لـەخوا دەپاڕایـەوە، كاتـێ بەسـەر ئایـەتێكی پەناگرتنـدا تێدەپـەڕی پەنای بەخوا دەگرت.

---

[19] **صحيح** – (موسلیم) لە كتابی (صلاة المسافرین وقصرها) ، بابی: (استحباب تطویل القراءة في صلاة اللیل) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨١١) ، هەروەها (ئەبوداود) لە كتابی (الصلاة) ، بابی: (ما یقول الرجل في ركوعه وسجوده) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٨٧١) ، هەروەها (ترمذی) لە كتابی (الصلاة) ، بابی: (ما جاء في التسبیح في الركوع والسجود) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٦٢) ، هەروەها (نەسائی) لە كتابی (الإفتتاح) ، بابی: (تعوذ القارئ إذا مر بآیة عذاب) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٠٧).

## ٧) هەوڵدان بۆ دەنگ خۆش کردن لەکاتی قورئان خوێندندا:

أ- لە (بەڕڕائی) کوڕی (عازیب) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( **زینوا القرآن بأصواتکم** ))[20] واتە : قورئان بڕازێننەوە بە دەنگ خۆشیتان.

ب- لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( **لیس منا من لم یتغن بالقرآن** ))[21] واتە : هەرکەس دەنگی بۆ قورئان خوێندن خۆش نەکات لە ئێمە نییە.

---

[20] **صحیح** - (ئەبوداود) لە کتابی (الصلاة) ، بابی: (استحباب الترتیل في القراءة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٦٨) ، هەروەها (نەسائی) لە (السنن الصغری) دا لە کتابی (الافتتاح) ، لە ژێر ناونیشانی: (تزیین القرآن بالصوت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠١٥) ، هەروەها (ابن ماجە) لە کتابی (إقامة الصلاة)، بابی: (في حسن الصوت بالقرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٤٢) ، هەروەها (دارەمی) لە کتابی (فضائل القرآن) ، بابی: (التغني بالقرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٤٣٤) ، هەروەها (ابن حبان) لە کتابی (الرقائق) ، بابی: (قراءة القرآن - ذکر إباحة تحسین المرء صوته بالقرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٤٩) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبی داود/ ج ٢، ص ٧٤، ح ١٤٦٨) ، و (سنن النسائی/ ج ٢، ص ١٧٩، ح ١٠١٥) ، و (سنن ابن ماجە/ ج ١، ص ٤٢٦، ح ١٣٤٢) ، و (صحیح الجامع الصغیر/ ح ٣٥٨٠) ، و (مشکاة المصابیح/ ج ١، ح ٢١٩٩) دا فەرموویەتی: (صحیح) ە.

[21] **صحیح** - (بوخاری) لە کتابی (التوحید) ، بابی : (قول الله تعالی : ﴿وأسروا قولکم أو اجهروا به﴾) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٥٢٧) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الکبری) دا لە کتابی (الشهادات) ، بابی : (تحسین الصوت بالقرآن والذکر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٥٧٣).

ج- له (جابر) ی کوڕی (عبدالله) وه (خوای لێ ڕازی بێت) دهگێڕنهوه کهوا فهرموویهتی: پێغهمبهری خوا (ﷺ) فهرموویهتی: (( **إن من أحسن الناس صوتا بالقرآن ، الذي إذا سمعتموه يقرأ ، حسبتموه يخشى الله** ))[٢٢]

واته : چاکترین دهنگ بۆ قورئان خوێندن دهنگی ئهوکهسهیه کاتێك گوێتان لێ بوو قورئان دهخوێنێ، ههست بکهن ئهوکهسه له خوا دهترسێت.

**٨) خوێندنی قورئان به تهرتیل:**

أ- خوای پهروهردگار لهو بارهیهوه به پێغهمبهرهکهی (ﷺ) دهفهرموێ: ﴿وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلًا﴾ (المزمل: ٤) واته: وه به ڕوون و ڕهوانی و به هێمنی و لهسهرخۆ قورئان بخوێنه و دهوری بکهرهوه- تا به جوانی لێی تێ بگهیت و سوودی لێ وهربگریت -.

ب- له (عبدالله) ی کوڕی (عهمر) ی کوڕی (عاص) ه وه دهگێڕنهوه کهوا فهرموویهتی: پێغهمبهری خوا (ﷺ) فهرموویهتی: (( **لا يفقه من قرأ القرآن في أقل من ثلاث** ))[٢٣]

---

[٢٢] **صحيح** - (ابن ماجه) له کتابی (إقامة الصلاة) ، بابی: (في حسن الصوت بالقرآن) گێڕاویهتهوه به ژماره (١٣٣٩) ، ههروهها (ابن المبارك) له کتێبی (الزهد والرقائق) دا ، بابی: (ما جاء في فضل العبادة) گێڕاویهتهوه به ژماره (١١٣) ، ههروهها شێخ (ئهلبانی) له (سنن ابن ماجه/ ج ١، ص ٤٢٥، ح ١٣٣٩) ، و صحيح الجامع الصغير/ ح ٢٢٠٢) دا فهرموویهتی: (صحيح) ه.

[٢٣] **صحيح** - (ئهبوداود) له کتابی (الصلاة)، بابی: (تحزيب القرآن) گێڕاویهتهوه به ژماره (١٣٩٤)، ههروهها (ترمذی) له کتابی (القراءات)، بابی: (١٣) گێڕاویهتهوه به ژماره (٢٩٤٨)، ههروهها (ابن ماحه) له کتابی (إقامة الصلاة والسنة فيها)، بابی: (في كم يستحب يختم القرآن) گێڕاویهتهوه به ژماره (١٣٤٧).

واتە: ئەوی بە سێ شەو کەمتر خەتمەیەکی قورئان بکات ئەوە لە دەستووری خوێندنی قورئان تێ نەگەییوە.

**٩) لەدوای خوێندنی هەموو ئایەتێك کەمێ بوەستە، دواتر دەست بکەرەوە بە خوێندنی ئایەتێکی تر:**

لە (ئوم سەلەمە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( **كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُقَطِّعُ قِرَاءَتَهُ ، يَقُولُ: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ ، ثُمَّ يَقِفُ ، ﴿الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ ، ثُمَّ يَقِفُ ، وَكَانَ يَقْرَؤُهَا ﴿مَلِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾** ))[٢٤]

واتە: قورئان خوێندنەکەی پێغەمبەر (ﷺ) پچڕ پچڕبوو: (بۆ نموونە) دەیفەرموو: (الحمد لله رب العالمين) پاشان دەوەستا، ئنجا دەیفەرموو: (الرحمن الرحيم) پاشان دەوەستا، ئنجا دەیفەرموو: (مالك يوم الدين). وە بەو شێوەیە ئایەتەکانی تریشی دەخوێند. وە هەندێ جار (مالك يوم الدين) ی بە (ملك يوم الدين) دەخوێندەوە.

---

[٢٤] **صحيح** - (ئەبوداود) لە کتابی (الحروف والقراءات) ، بابی: (منه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٠٠١) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (القراءات) ، بابی: (في فاتحة الكتاب) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٩٢٧) ، هەروەها لە کتێبی (الشمائل المحمدية) دا ، بابی: (ما جاء في قراءة رسول الله (ﷺ) ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٠٤) ، هەروەها (دارەقوتنی) لە کتابی (الصلاة) ، بابی: (وجوب قراءة بسم الله الرحمن الرحيم في الصلاة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٢٩) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبی داود/ ج ٤، ص ٣٧، ح ٤٠٠١) ، و (جامع الترمذی/ ج ٥، ص ١٨٥، ح ٢٩٢٧) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٥٠٠٠) ، و (مختصر الشمائل/ ص ١٦٦، ح ٢٦٩) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

**١٠) گوێ گرتن له قورئان خوێندنەکەی خۆی و جگە له خۆیشی:**

خـوای پــەروەردگار لــەو بارەیــەوە دەفــەرموێ: ﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾ (الأعراف: ٢٠٤)

واتە : کاتێکیش کە قورئان دەخوێندرێت، ئەوە گوێی بۆ بگرن و دڵی بدەنێ و بێ دەنگ بن، بۆ ئەوەی ڕەحمتان پێ بکرێ و پەروەردگار بەزەیی پێتاندا بێتەوە.

**١١) نەبڕینی قورئان خوێندنەکە تەنها لەکاتی زۆر پێویستدا نەبێ:**

لـه (جـابر) ی کـوڕی (عبـدالله) وه (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویەتی: (( **خرجنا مع رسول الله (ﷺ) – يعني في غزوة ذات الرقاع – فأصاب رجل امرأة رجل من المشركين ، فحلف أن لا أنتهي حتى أهريق دما في أصحاب محمد، فخرج يتبع أثر النبي (ﷺ) ، فنزل النبي (ﷺ) منزلا، فقال: من رجل يكلؤنا؟ فانتدب رجل من المهاجرين ورجل من الأنصار، فقال: كونا بفم الشعب، قال: فلما خرج الرجلان إلى فم الشعب اضطجع المهاجري ، وقام الأنصاري يصل ، وأتى الرجل فلما رأى شخصه عرف أنه ربيئة للقوم، فرماه بسهم فوضعه فيه، فنزعه ، حتى رماه بثلاثة أسهم ، ثم ركع وسجد، ثم انتبه صاحبه ، فلما عرف أنهم قد نذروا به هرب، ولما رأى المهاجري ما بالأنصاري من الدم ، قال: سبحان الله! ألا أنبهتني أول ما رمى؟ قال: كنت في سورة أقرؤها فلم أحب أن أقطعها** ))[٢٥]

---

[٢٥] **حسن** – (ئەبوداود) له کتابی (الطهارة) ، بابی: (الوضوء من الدم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٨) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) له (سنن أبی داود / ج ١، ص٥٠، ح ١٩٨) دا فەرموویەتی: (حسن) ە.

واته : لەگەڵ پێغەمبەری خـوادا (ﷺ) دەرچووین بۆ غەزایە (واتـە: غـەزای ذات الرقـاع)، پیـاوێ ژنـی پیـاوێکی هاوبـەش پەیداکـەری کوشـت، پیـاوە موشریکەکە سوێندی خوارد کە واز نەهێنێ هەتا خوێنی یەکێ لـە هـاوەڵانی (موحەممەد) نەرێژێ، ئەوە بوو دووراو دوور شوێنی پێغەمبـەر (ﷺ) کـەوت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە شیوێکدا دابەزی بۆ وچاندان، فـەرمووی: ئەمشەو کێ پاسـەوانیمان دەکات؟ پیـاوێ لـە کۆچـەران (موهـاجیرین) و پیـاوێ لـە یاریدەدەران (ئەنصار) هەستان. فـەرمووی: لـە دەم کـەلی شـیوەکەوە بـن. (جابیر) دەفـەرموێ: کاتـێ کـە دوو پیاوەکـە گەیشتنە دەم کـەلی شـیوەکە شـەویان دابـەش کـرد بـۆ پاسـەوانی، کۆچـەرەکە لێـی ڕاکـشاو خـەوت، ئەنصارییەکەش هەستا دەستی کرد بە شەونوێژ کردن، پیـاوە موشـریکەکە هـات، کـە زانـی پاسـەوانی قەومەکەیـە تیرێکـی تـێ گـرت و برینـداری کـرد، ئەویش تیرەکەی دەرهێناو هەر لەسەر نوێژکردن بەردەوام بوو، ئنجا تـیری دووەمی تێ گرت و پێکای، بەڵام ئەو هەر نوێژەکەی نەبڕی و بەردەوام بـوو لە نوێژکردنەکەی، دیسان بۆ جاری سێیەم تیرێکی تری تێ گـرت و پێکـای، ئەویش ڕکوع و سـەجدەی بـرد بـەو شـێوەیە نوێژەکـەی تـەواو کـرد، ئنجـا هاوڕێکەی لە خەو هەستان و ئاگاداری کردەوە کە دوژمـن هاتۆتـە سـەریان، پیاوە هاوبەش پەیداکەرەکـەش کاتـێ زانـی هاوەڵەکـەی ئاگـادار کردۆتـەوە یەکسەر هەڵهات، هاوەڵە کۆچەرییەکەشی کاتێ کە ئەوی بە خـوێنەوە بینی، وتی: (سبحان الله)! بۆ هەر یەکەم تیر خەبەرت نەکردمـەوە؟ ئـەویش وتـی:

له خوێندنی سورەتێکی قورئاندا بووم، جا پێم خۆش نەبوو کە بیبڕم و تەواوی نەکەم.

**١٢) کاتێ دەگەیت بە ئایەتی سەجدە، سەجدە بەرەو نزای سەجدەشی تیادا بخوێنە:**

لە (ئیبنوعومەر) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی:

(( أن النبي (ﷺ) **كان يقرأ القرآن ، فيقرأ سورة فيها سجدة ، فيسجد ونسجد معه ، حتى ما يجد بعضنا موضعا لمكان جبهته** ))[٢٦]

واتە : جاران کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەو سورەتانەی دەخوێند کە ئایەتی کوڕنووش (ئایەتی سەجدە) یان تیایە، بۆ خۆی کوڕنووشی قورئان خوێندنی دەبرد و ئێمەش لەگەڵیا ئەو کوڕنووشەمان دەبرد، جا لە بەر زۆری عەشاماتەکە هەندێکمان جێگەی دەست نەدەکەوت هەتا لە کاتی کوڕنووشەکەدا تەوێڵی لەسەر دانێ.

**١٣) بەپێوە و بە دانیشتنەوە و بەپاڵ کەوتنیشەوە دەتوانی قورئان بخوێنی:**

خوای پەروەردگار لەو بارەیەوە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ ﴾ (آل عمران: ١٩١)

واتە: ئەوانەی یادی خوا دەکەن لە کاتێکدا کە بە پێوەن یان دانیشتوون یان ڕاکشاون.

---

[٢٦] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (سجود القرآن) ، بابی: (من سجد لسجود القارىء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٧٥) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (المساجد ومواضع الصلاة) ، بابی: (سجود القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٩٥) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الصلاة) ، بابی: (في الرجل يسمع السجدة وهو راكب ، أو في غير الصلاة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤١٢).

**١٤) سيواك كردن:**

أ- له (عەلى) كوڕى (ئەبوتاڵيب) ە وە (خواى لىٚ ڕازى بيٚت) دەگيٚڕنەوە كەوا فەرموويەتى: پيٚغەمبەرى خوا (ﷺ) فەرموويەتى: (( **إن العبد إذا تسوك ، ثم قام يصلي قام الملك خلفه ، فتسمع لقراءته فيدنو منه - أو كلمة نحوها- حتى يضع فاه على فيه ، فما يخرج من فيه شيء من القرآن ، إلا صار في جوف الملك ، فطهروا أفواهكم للقرآن** ))[٢٧]

واتە : بەندە كاتىٚ سيوا دەكا، پاشان هەستا نويٚژ بكات، مەلائيكەيەك ديٚت لە پشتيەوە دەوەستيٚت گوىٚ لە قورئان - خويٚندنەكەى - دەگريٚت و نزيك دەبيٚتەوە، بە بەردەوامى گوىٚ دەگريٚت و نزيك دەبيٚتەوە، هەتا دەم دەخاتە سەر دەمى، جا هەر ئايەتيٚك دەخويٚنيٚت دەچيٚتە قورگى مەلائيكەتەكەوە، جا لەبەر ئەوە پيٚش ئەوەى قورئان بخويٚنن دەمتان بە سيواك پاك بكەنەوە.

ب- لە (عەلى) كوڕى (ئەبوتاڵيب) ە وە (خواى لىٚ ڕازى بيٚت) دەگيٚڕنەوە كەوا فەرموويەتى: (( **أمرنا بالسواك** ))[٢٨] واتە : فەرمانمان پيٚكراوە بە سيواك كردن.

---

[٢٧] **إسناده جيد** - (بەززار) لە موسنەدەكەيدا (البحر الزخار) ، لە ژيٚر ناونيشانى: (ومما روى سعد بن عبيده) گيٚڕاويەتەوە بە ژمارە (٥٤٧) ، هەروەها (ابن المبارك) لە كتيٚبى (الزهد والرقائق) دا ، بابى: (فضل ذكر الله عز وجل) گيٚڕاويەتەوە بە ژمارە (١٢١٠) ، هەروەها شيٚخ (ئەلبانى) لە (سلسلة الأحاديث الصحيحة / ج ٣، ص ٢١٤، ح ١٢١٣) دا فەرموويەتى: ئيسنادەكەى (جيد) ە.

[٢٨] (بەيهەقى) لە (السنن الكبرى) دا لە كتابى (الطهارة) ، بابى: (تأكيد السواك عند القيام إلى الصلاة) گيٚڕاويەتەوە بە ژمارە (١٥١) ، هەروەها لە (شعب الإيمان) دا لە ژيٚر ناونيشانى: (فصل في السواك لقراءة القرآن) گيٚڕاويەتەوە بە ژمارە (٢٠٤٦).

ج- هەر لە (عەلی) کوڕی (ئەبوتالیب) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( **إن أفواهكم طرق للقرآن ، فطيبوها بالسواك** ))[29]

واتە : بەڕاستی دەمتان ڕێگایە بۆ قورئان، کەوابوو بە سیواك کردن پاکی بکەنەوە.

**١٥) با قورئان خوێندنەکە بەشێوەیە بێ کە دڵ خشوع پەیا بکاو تام و چێژی تێدا ببینێ:** .

أ- خوای پەروەردگار لەو بارەیەوە دەفەرموێ: ﴿ لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا الْقُرْآنَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ ۚ وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ (الحشر: ٢١)

واتە: ئەگەر بێتوو بهاتایە ئەم قورئانەمان دا ببەزاندایەتە خوارەوە بۆ سەر کەژ و کیوێك، ئەو شاخەت دەبینی بە مل کەچی و گەردن کەچی، کە ورد و خاش و شەق وپەق دەبوو لە بیم و ترسی خوا - و هەیبەتی گەورەیی و دەسەڵاتی- بەڕاستی ئێمە بۆیە ئەم جۆرە نموونانە دەهێنینەوە بۆ خەڵکی بۆ ئەوەیە بەڵکو تێفکرن و بیر بکەنەوە.

واتە بەڵکو بەهۆی ئەو بیر کردنەوەیەوە ژیرییان بخەنەکار و شوێن قورئانی پیرۆز بکەون.

---

[29] **صحيح** - (ابن ماجە) لە کتابی (الطهارة وسننها) ، بابی: (السواك) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٩١) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن ابن ماجە/ ج ١، ص ١٠٦، ح ٢٩١) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

ب- هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا ۩ ﴾ (الإسراء: ١٠٩) واتە: ئەوانە سەجدە و کوڕنووش دەبەن (بۆ خوا) و دەگرین و ئەسرینی خۆشەویستی پەروەردگار لە چاوانیان دەبارێت، فرمێسکی ئیمان و شادی هەڵدەوەرێنن و تا دێت زیاتر ملکەچ و فەرمانبەردار و دڵ پڕ لە ئیمان دەبن.

**١٦) با خوێندنەوەکە پەلە پەلی تێدا نەکرێ بۆ ئەوەی هەوڵ بدەی بگەی بە سورەتێکی تر، بەڵکو بە ئارامی و لەسەر خۆیی بێ.**

**١٧) با قورئان خوێندنەکە بە تەدەبور و تێڕامانەوە بێت:**

أ- خوای پەروەردگار لەو بارەیەوە دەفەرموێ: ﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾ (ص: ٢٩)

واتە: - ئەی پێغەمبەر - ئەم قورئانەی کە دامان بەزاندووەتە لای تۆ پەڕاوێکی زۆر پیرۆز و بە فەڕە، بۆ ئەوەی بەندەکان بە جوانی لە ئایەتەکانی ورد ببنەوە و لێکی بدەنەوە- تا هەموو حەق و ناحەقیەکیان بۆ ڕوون ببێتەوە- وە ئەوانەش کە خاوەنی بیر و هۆشن با پەند و ئامۆژگاری وەربگرن و پەیڕەوی بکەن.

ب- هەروەها دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴾ (محمد: ٢٤)

واتە: دەی ئایا ئەوانە بیرناکەنەوە و بە وردی تێ نافکرن لەم قورئانە و بە جوانی سەرنجی نادەن تا ڕێنموونی لێ وەربگرن، - واتە ئەو دووڕووانە

ئەگەر مەبەستیان چوونە سەر ڕێی ڕاست بێت ئەوە پێویستە کەوا بە جوانی سەرنجی قورئان بدەن و تەدەببوری تێدا بکەن، تا بە هۆی ئەوەوە خوای گەورە ڕێنموونیان بکات و بیانخاتە سەر ڕێی ڕاست ، چونکە بەڕاستی خوای پەروەردگار زوڵم و ستەم لە هیچ کەسێك لە بەندەکانی ناکات و، پێی خۆشە کەوا هەموویان ڕێی ڕاست و خواپەرستی بگرنە بەر و لەڕێی چەوت و چەوێڵ لا بدەن. یا ئەوەتا ئەو – دووڕووانە– دڵەکانیان بە جۆرێکە کە قوفڵی لێدراوە و بە هیچ جۆرێك ناکرێتەوە– لە ئاستی قورئاندا و ناتوانن بە جوانی سەرنجی بدەن و تێی بگەن–.

ج– لە (عەلی) کوڕی (ئەبی تالیب) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( **لا خير في عبادة لا علم فيها ، ولا علم لا فهم فيه ، ولا قراءة لا تدبر فيها** ))[٣٠]

واتە : هیچ خێرو چاکەیە نییە لە عیبادەت و پەرستشێکا کە عیلم و زانیاری تیادا نەبێ، وە هیچ زانیاریەکیش خێرو چاکەی تیادا نییە کە فەهم و حاڵی بوونی لەگەڵا نەبێ، وە هیچ خێرو چاکەیەکیش نییە لە قورئان خوێندنێکدا کە تەدەبورو تێڕامانی تیادا نەبێ.

---

[٣٠] (دارەمی) لە (سنن) ە کەیدا ، بابی: (من قال: العلم: الخشية وتقوى الله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٣) ، هەروەها (ئەبی نوعەیم) لە کتێبی (حلية الأولياء) دا ، بابی: (وثيق عباراته ودقيق إشاراته) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٣٥) ، هەروەها (محمد بن الضريس) لە کتێبی (فضائل القرآن) دا ، بابی: (ما قيل في فضل الألف واللام من القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٧).

د- لـه (ئیبنوعـەبباس) ە وە (خـوای لیّ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویەتی: (( **لأن أقرأ: ﴿إذا زلزلت﴾ و﴿القارعة﴾ أتدبرهما، أحب إليّ من أقرأ: ﴿البقرة﴾ و ﴿آل عمران﴾ تهذيرا** ))*

واتـە : گـەر سـورەتی ﴿**الزلزلة**﴾ و ﴿**القارعة**﴾ بخوێنمـەوە و تـەدەبور و تێڕامانی تیادا بکەم، لەوە پێم خۆشترە کە سورەتی ﴿**البقرة**﴾ و ﴿**آل عمران**﴾ بە پەلە پەل بخوێنمەوە و نەزانم چیم خوێندووە !

هـ- لـه (ئیبنومەسـعود) ە وە (خـوای لیّ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویەتی: (( **من أراد علم الأولين والآخرين، فليتدبر القرآن** ))[31]

واتە : هەرکەسێ بیەوێ عیلم و زانستی پێشینان و پاشینان وەربگرێت، ئەوە با تەدەبور و تێڕامان لە ئایەتەکانی قورئاندا بکات.

و- لە (حەسەن) ی بەصرییەوە (ڕەحمەتی خوای لیّ بیّ) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: (( **إن من كان قبلكم رأوا أن هذا القرآن رسائل إليهم من ربهم، فكانوا يتدبرونها بالليل ، وينفذونها في النهار** ))*

واتە : ئەوانـەی پـێش ئێوە وایان دەبینـی: کـە قورئـان پـەیامێکە لەلایـەن پەروەردگاریانەوە بۆیان نێرراوە، لەبەر ئەوە بە شەو تەدەبور و تێڕامان لـە ئایەتەکانیدا دەکرد و، بە ڕۆژیش کاریان بەو پەیام و ڕێنماییانـە دەکرد کە شەو دەیانخوێندەوە و تێڕامانیان تیادا دەکرد.

---

* (أحكام التجويد/ ج ١، ص ٢٠).

[31] (محمد بن نصر المروزي) لە کتێبی (قيام الليل) دا ، بابی: (ثواب القراءة بالليل) گێڕاویەتـەوە بـە ژمارە (٢١٣).

* (أحكام التجويد/ ج ١، ص ٢٠).

**١٨) وتنی (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) لەپێش هەموو قورئان خوێندنێكدا:**

خوای پەروەردگار لەو بارەیەوە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْءَانَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴾ (النحل: ٩٨) واتە: جا كاتێك ویستت قورئان بخوێنی ئەوە پەنا بگرە بە خوای گەورە لە شەیتانی نەفرین لێكراو.

**شێوەكانی وتنی پەناگرتن بەخوا لە شەیتانی نەفرین لێكراو (الإستعاذة):**

قورئان خوێن دەتوانێ بەیەكێ لەم صیغە و داڕشتنانە پەنا بەخوا بگرێ لە شەیتانی نەفرین لێكراو كە ئەویش بریتین لە:

أ- وتنی: **(أعوذ بالله من الشيطان الرجيم).**

ب- یا وتنی: **(أعوذ بالله السميع العليم من الشيطان الرجيم).**

ج- یا وتنی: **(أعوذ بالله من الشيطان الرجيم من همزه ونفخه ونفثه).**

د- یا وتنی: **(أعوذ بالله السميع العليم من الشيطان الرجيم من همزه ونفخه ونفثه).**

١- لە (ئەبوسەعید) ی خودرییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا فەرموویەتی: ((**أن رسول الله (ﷺ) كان يقول قبل القراءة: أعوذ بالله من الشيطان الرجيم**))[٣٢]

---

[٣٢] - (عبدالرزاق) لە (مصنف) ە كەیدا ، لە كتابی (الصلاة) ، بابی: (متى يستعيذ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٥٨٩) ، هەروەها (ابن المنذر) لە كتێبی (الأوسط) دا ، لە كتابی (صفة الصلاة) ، بابی: (ذكر الاستعاذة في الصلاة قبل القراءة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٣٠).

واتـه: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەسـتووری وابـوو لـه پـێش قورئـان خوێنـدنا دەیفەرموو: **(أعوذ بالله من الشيطان الرجيم)** خوایـه پـەنا دەگرم بـەتۆ لـه شەیتانی نەفرین لێکراو.

٢- له (ئەبو سەعید) ی خودرییەوه (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنـەوه کـەوا فەرموویەتی: (( **كان رسول الله (ﷺ) إذا قام من الليل كبر، ثم يقول: ....، أعوذ بالله السميع العليم من الشيطان الرجيم من همزه ، ونفخه ، ونفثه ، ثم يقرأ** ))[٣٣]

واته : پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتـێ هەڵدەسـتا بـۆ شـەونوێژ (الله أکـبر) ێکـی دەکـرد، پاشـان دەیفـەرموو: ....، پـەنادەگرم بـه خـوای بیسـەری زانـا لـه شـەیتانی نـەفرین لێکـراو لـه دەسـت وەشـاندنی ، و فیـززلی ، و شـیعر و بارۆلەی، پاشان قورئانی دەخوێند.

**شوێنی وتنی پەناگرتن بەخوا له شەیتان ( محلها ):**

له پێش دەست پێ کردن به قورئان خوێندندا دەوترێت، وه بەشێکیش نییه له قورئان.

---

[٣٣] **صحيح** - (ئەبوداود) له کتابی (الصلاة)، بابی: (ما يستفتح به الصلاة من الدعاء) گێڕاویەتـەوه بـه ژماره (٧٦٤) و (٧٧٥)، هەروەها (ترمذی) له کتابی (الصلاة)، بابی: (ما يقول عند افتتاح الصلاة) گێڕاویەتەوه به ژماره (٢٤٢)، هەروەها (ابن ماجه) لـه کتـابی (إقامة الصلاة والسنة فيها)، بـابی: (الإستعاذة في الصلاة) گێڕاویەتەوه به ژماره (١٣٥٥) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) له (سنن أبی داود / ج ١، ص ٢٠٦، ح ٧٧٥) ، و (الجامع الترمذی/ ج ٢، ص ٩، ح ٢٤٢) ، و (مشكاة المصابيح / ج ١، ح ١٢١٧) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

**حوكمی وتنی پەناگرتن بەخوا لە شەیتان ( حكمها ):**

لـەلای جومهـوری زانایـان سـوننەتە، بـەڵام لای هەنـدێكی تـر لـە زانایـان پێویـستە، چـونكە لـەو بارەیـەوە خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾.

**ئەو كاتانەی كە وتنی ( پەناگرتن بەخوا لە شەیتان ) واچاكە بەدەنگی بەرز بێت:**

**یەكـەم:** ئەگـەر قورئـان خـوێن ویـستی بـەدەنگی بـەرز قورئـان بخوێنـێ و كەسێكیش گوێ بیستی دەبوو.

**دووەم:** لەكاتی فێركردن و وتنەوەی قورئاندا.

**سێیەم:** لە دەست پێكردنی قورئان خوێندنی بە كۆمەڵدا.

**ئەو كاتانەی كە وتنی ( پەناگرتن بەخوا لە شەیتان ) واچاكە بەدەنگی نزم بێت:**

**یەكەم:** لە نوێژكردنی فەرز و سوننەتدا.

**دووەم:** كەسێك بە تەنها و بۆ خۆی قورئان بخوێنێت.

**سێیەم:** لە كۆڕو مەجلیسی قورئان خوێندنی بە كۆمەڵدا.

**١٩) وتنى (بسم الله الرحمن الرحيم) لەدەست پێکى هەموو سورەتێکدا جگە لە سورەتى (التوبة):**

**شێوەکانى وتنى (بسم الله الرحمن الرحيم):**

تەنها یەك شێوەى هەیە ئەویش (بسم الله الرحمن الرحيم) ە.

**شوێنى وتنى (بسم الله الرحمن الرحيم):**

لەپێش دەست کردن بە قورئان خوێندن دەخوێنرێت.

**حوکمى وتنى (بسم الله الرحمن الرحيم):**

زانایان لەسەر ئەوە پێکهاتوون کە (بسم الله الرحمن الرحيم) بەشێکە لە ئایەتى سورەتى (النمل)، بەلاّم جیاوازییان هەیە لەو (بسم الله الرحمن الرحيم) انەى کە کەوتوونەتە سەرەتاى سورەتەکانى قورئانى پیرۆزەوە، لەمەدا سێ بۆچوونى بەناوبانگ هەیە کە ئەمانەن:

**یەکەم:** (بسم الله الرحمن الرحيم) ئایەتێکە لە سورەتى (فاتیحە) و هەموو سورەتەکانى ترى قورئان جگە لە سورەتى (التوبة)، کەواتە خوێندنى لە سورەتى (فاتیحە) دا واجبە، وە حوکمەکەى وەك حوکمى (فاتیحە) یە لە ئاشکراو نهێنى دا.

**دووەم:** (بسم الله الرحمن الرحيم) تەنها ئایەتێکە لە سورەتى (فاتیحە).

**سێیەم:** (بسم الله الرحمن الرحيم) ئایەتێکى سەربەخۆیە بۆ پیرۆزى و جیاکردنەوەى سورەتەکان هاتووە، وە خوێندنى لە سەرەتاى سورەتى (فاتیحە) دا دروستە، بەلّکو موستەحەببیشە، بەلاّم بە دەنگى بەرز وتنى

(لـه ئیمامـەتی نوێـژا) سـوننەت نییـە، بـەڵکو سـوننەت وایـە بـە نهێنـی بخوێنرێ*: ئەمەش مەزهەبی حەنبەلیـەکان و ئەصحابی ڕەئـی و، هـەروەها هەڵبژاردەی شێخی ئیسلام – ئیبنوتەیمیە – شە.

**چوارەم:** (بسم الله الرحمن الرحيم) ئایەتێك نییە نە لـە سـورەتی (فاتیحـە) و نە لە سورەتەکانی تری قورئان، وە خوێندنی لە نوێژدا مەکروهە بـە دەنگـی بەرز و بە دەنگی نزمیش، لە نوێژی فەرزا نـەك سـوننەت، وە ئـەم بۆچـوونە بەهێز نییە.

**شێوازەکانی خوێندنی (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) و (بسم الله الـرحمن الـرحيم) و سورەتەکە لەکاتی قورئان خوێندندا:**

**یەکەم:** جیاکردنەوەی هەرسـێکیان لـە یـەکتر، واتـە: کاتـێ (أعـوذ بـالله مـن الشيطان الرجيم) دەخوێنی کەمێ بوەستە، ئەوجا (بسم الله الرحمن الرحيم) بخوێنە و کەمێ بوەستە، پاشان دەست بکە بە خوێندنی سورەتەکە.

**دووەم:** خوێنـدنی (أعـوذ بـالله مـن الـشيطان الـرجيم) و (بـسم الله الـرحمن الرحيم) بەسەریەکەوە و کەمێ وەستان، پاشان خوێندنی سورەتەکە.

**سێیەم:** خوێندنی (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) و کەمێ وەسـتان، پاشـان (بـسم الله الـرحمن الـرحيم) بخوێنـە و یەکـسەر دەسـت بکـە بـە خوێنـدنی سورەتەکە.

---

* بەڵام ڕای بەناوبانگی ئیمـام (شـافیعی) ئەوەیـە: کـە سـوننەتە نوێـژخوێن لـە سـەرەتای خوێنـدنی سورەتی (فاتیحە) دا (بسم الله الرحمن الرحيم) بە دەنگی بەرز بخوێنێت.

**چوارەم:** خوێندنی هەرسێکیان بەسەر یەکەوە، واتە: کاتێ (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم) دەخوێنی، یەکسەر دەست بکە بە خوێندنی (بسم الله الرحمن الرحیم) و سورەتەکەش.

**٢٠)** لە هەمووی گرنگتر کردەوە کردنە بە فەرمایشتەکانی ئەم قورئانە کە کەلامی خوای پەروەردگارە، چونکە خوای گەورە پەیامی قورئانی بۆ ئەوە نەناردووە کە هەر بیخوێنینەوە و لەبەری بکەین، بەڵکو قورئانی بۆ ئەوە ناردووە کە کردەوەی پێ بکرێ و بکرێتە بەرنامەی ڕۆژانەی مرۆڤەکان و، ژیانی شەوو ڕۆژیانی لەسەر بنیات بنرێ و بەپێی ئەو پەیامە نەبێ هیچ هەنگاوێکی گرنگ و مەصیری نەنێن:

أ- لە (عبدالله) ی کوڕی (عومەر) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( **لقد عشنا برهة من دهرنا ، وأحدنا يؤتى الإيمان قبل القرآن ، وتنزل السورة على محمد فنتعلم حلالها وحرامها ، وآمرها وزاجرها ، وما ينبغي أن يقف عنده منها ، كما تعلمون أنتم اليوم القرآن ، ثم لقد رأيت اليوم رجالا يؤتى أحدهم القرآن قبل الإيمان ، فيقرأ ما بين فاتحته إلى خاتمته ما يدري ما آمره ولا زاجره ، ولا ما ينبغي أن يقف عنده منه ، فينثره نثر الدقل** ))[٣٤]

---

[٣٤] **صحيح** - (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (صلاة الإمام وصفة الأئمة) ، بابی: (البيان أنه إنما قيل: يؤمهم أقرؤهم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٩١٦) ، هەروەها (حاکم) لە (مستدرك) دا لە کتابی (الإيمان) ، بابی: (أما حديث معمر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٨) ، هەروەها (محمد بن نصر المروزي) لە کتێبی (قيام الليل) دا ، بابی: (ثواب القراءة بالليل) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٢) ، هەروەها (هەیثەمی) لە (مجمع الزوائد/ ج ١، ص ٤٠٤) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

واته : بێگومان ماوەیەکی باش ژیاین لە سەردەمی خۆمانا، وە هەر یەکێ لە ئێمە فێری باوەڕو ئیمان دەبوو، وە بە باشی دەچەسپا لە دڵیا، پێش ئەوەی فێری قورئان ببێ و وەری بگرێ، ئەوجا کاتێ سورەت و ئایەتەکانی قورئان دادەبەزی بۆسەر موحەممەدی سەروەر (ﷺ)، ئێمەیش فێری حەڵاڵ و حەرام و، فەرمان و قەدەغەکانی دەبووین و، وە لەو شوێنەی کە پێویست بوو دەوەستاین و سەرنجمان دەدا و تێڕامانمان دەکرد بۆی، هەروەك چۆن ئێوە ئێستا فێری قورئان دەبن، جا ئێستا بێگومان پیاوانێ دەبینین کە فێری قورئان دەبن پێش ئەوەی فێری باوەڕو ئیمان ببن، وە لە سورەتی (فاتیحە) وە دەست دەکەن بە خوێندنی هەتا دەگاتە دوایین سورەتی قورئان، بێ ئەوەی بزانێ فەرمان و قەدەغەکانی ئەم قورئانە چییە ! وە ناشزانێ لە چ شوێنێکی قورئاندا بوەستێ و تێڕامان بکات، هەروەك چۆن دەنکە خورمای پێ نەگەییوو لە دارەکەی دەکەوێتە خوارو سوودی تێدا نییە بۆ خواردن، ئەوانیش ئا بەو شێوەیە قورئان دەخوێنن و سوود لە ناوەڕۆکەکەی نابینن و سەرنج نادەن بزانن خوای گەورە چی فەرمووە پێیان ! ؟

ب- لە (ئیبنومەسعود) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( **كان الرجل منا إذا تعلم عشر آيات لم يتجاوزهن حتى يعرف معانيهن والعمل بهن** ))[٣٥] واته : هەر پیاوێ لە ئێمە کاتێ دە ئایەتی

---

[٣٥] **صحيح** - (طەبەری) لە تەفسیرەکەیدا (جامع البيان في تفسير القرآن) ، بابی: (ذكر بعض الأخبار التي رويت في الحض على العلم بتفسير القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٣) ، هەروەها (حاکم) لە (مستدرك) دا لە کتابی (فضائل القرآن) ، بابی: (أخبار في فضائل القرآن جملة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە

قورئان فێردەبوو، ئیتر وازی لێ نەدەهێنا هەتا بەجوانی واتاو مانای ئەو دە ئایەتە تێ نەگەیشتایە و کردەوەی پێ نەکردایە.

**چەند ئادابێکی تری (قورئان خوێندن) کە پێشەوا (نەوەوی) لە (أذکار) دا فەرموویەتی و ئاماژەی پێکردووە* :**

١) بوونی دڵسۆزی لە خوێندنەوەکەدا.

٢) مەبەست تەنها ڕەزامەندی خوا بێت ، وە مەبەست گەیشتن بە ئامانجێکی تر نەبێ.

٣) پاراستنی ئەدەب لە کاتی خوێندنەوەیدا.

٤) لە زیهن و مێشکیدا ئاگایی ئەوەی هەبێ کە گفتوگۆ لەگەڵ خوای گەورەدا دەکات و خەریکی دەورکردنەوەی فەرمایشتەکانی ئەوە.

٥) بە جۆرێ بیخوێنێ کە خوای گەورە دەبینێ، جا ئەگەر ئەویش خوا نەبینێ ئەوە بێگومان خوای پەروەردگار ئەو دەبینێ.

٦) جا کاتێ ویستی دەست بکات بە خوێندنەوەی ئەوە با دەمی پاك بکاتەوە لە هەموو جۆرە پیسیەك ، وە سوننەتە سیواك بکات.

٧) وە پێویستە بە مل کەچی و مل کزییەوە بچێتە ناو ئایەتەکانی قورئانەوە.

---

(١٩٨٩) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الکبری) دا لە کتابی (صلاة الإمام وصفة الأئمة) ، بابی: (البیان أنه إنما قیل: یؤمهم أقرؤهم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٩١٥).

* بۆ نووسینی ئەم ئادابانە سوود وەرگیراوە لە (الأذکار لإمام النووي – في مسائل وآداب ینبغي للقاريء الإعتناء بها).

٨) وە پێویستە وردبوونەوەی قووڵی هەبێ بۆ ئایەتەکانی قورئان.

**جا پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ:** لە ڕاستیدا ئەمەش داواکراوە لە کاتی قورئان خوێندنەوەدا بۆ ئەوەی دڵ و دەروون مونشەریح بێ و پاڵفتە ببێ لە هەموو جۆرە نەخۆشیەك، چونکە هەبووە کۆمەڵێ لە پێشینان شەو تا بەیانی یەك ئایەتی خوێندوەتەوە و وردبۆتەوە تیایدا، یاخود زۆربەی شەوەکە هەر بە یەك ئایەتەوە خەریك بووە و تەدەبوری تێدا کردووە، وە هەیان بووە لە کاتی قورئان خوێندنەوەدا هاوار و ناڵەی لێ هەستاوە و، وە هەیان بووە مردووە لە تاوا.

وە هەروەها لە کاتی خوێندنەوەی قورئاندا موستەحەببە بگری و بکەویتە گریانەوە، چونکە گریان لە کاتی خوێندنەوەی قورئاندا لە سیفاتی خواناسانە و، وە دروشم و نیشانەی بەندە چاکەکانی خوای پەروەردگارە.

بۆیە لەو بارەیەوە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا ۩ ﴾ (الإسراء : ١٠٩)

واتە : ئەوانە سوژدە و کڕنووش دەبەن و دەگرین و، ئەسرینی خۆشەویستی پەروەردگار لە چاوانیان دەبارێت و، تا دێت زیاتر ملکەچ و فەرمانبەردار و دڵ پڕ لە ئیمان دەبن*.

هەروەها لەم بارەیەوە (إبراهیم الخواص) (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: (( دواء القلب خمسة أشياء: قراءة القرآن بالتدبر، وخلاص البطن ، وقيام الليل، والتضرع عند السحر، ومجالسة الصالحين ))*

---

* بۆ زیاتر شارەزابوون لەم بابەتە بڕوانە: (التبيان في آداب حملة القرآن – لإمام النووي).

واتــه : دەرمــانی دڵ پێــنج شــته: خوێنــدنی قورئــان بــه تــەدەبورەوە، وە دەربازکردنی سك لە خواردنی حەرام، وە هەستان بـه شـەو بۆ ئەنجامدانی نوێژ و خواپەرستی، وە کوڕوزانەوە لە بەیانیاندا ، وە دانیشتن لـه خزمـەت پیاوچاکاندا.

٩) خوێندنــەوەی قورئــان لــه دوو تــوێی موصــحەفەکەدا چــاکترە لــه خوێندنەوەی بە لەبەر.

١٠) خوێندنەوەی بە جۆرێ کە خۆت گوێ بیستی ببی چاکترە لـەوەی کـه گوێت لێی نەبێ، بە مـەرجێ نوێژکـەر و قورئـان خـوێنی تـر لـه دەوروبـەرت نەبن.

**لە سوودەکانی قورئان خوێندن بە دەنگی بەرز:**

أ– سوودی بۆ کەسانی دەوروبەر زۆرە.

ب– دڵی قورئان خوێن بە ئاگا دەهێنێتەوە.

ج– هەموو مەراقی دەبێتە بیرکردنەوە لە ئایەتەکانی قورئان.

د– وە هەوڵدەدا زیاتر گوێ بداتە خوێندنەوەکەی.

هـ– دەبێتە مایەی لابردنی خەو.

و– چالاکی زیاد دەکات.

ز– دەبێتە هۆی بە ئاگا هێنانەوەی کەسانی خەوتوو و بێ ئاگا.

---

* (التبيان في آداب حملة القرآن – لإمام النووي / ج ١، ص ٣٧) ، و (حلية الأولياء / ج ١٠، ص ٣٢٧) ، و (الأذكار لإمام النووي / ج ١، ص ٢٤٩) ، و (صفة الصفوة / ج ٤، ص ١٠١).

١١) هـــەروەها موســـتەحەببە دەنگــی خــۆی خــۆش بكـــات بـــە قورئـــان خوێندنەوە.

١٢) وە خۆی بە دوور بگرێ لە لەحن بازی و خوێندنەوەیەك كە شێوەی لـە گۆرانی بچێ.

١٣) وە زیـادە ڕەوی نـەكات لـە خوێندنـەوەی ئایەتەكانـدا و جـوان بیـان خوێنێت.

١٤) هـــەروەها موســـتەحەببە بـــۆی كـــەوا كاتـــێ ویـــستی لـــە ناوەڕاســـتی سورەتێكەوە دەست پێ بكات ئەوە با لەو ئایەتانەوە دەست پێ بكـات كـە پەیوەندی بە ئایەتەكانی دوای خۆیەوە هەیە.

١٥) وە ئەگەر ویستی كۆتایی بە قورئان خوێندنەوەكـەی بهێنـێ ، ئـەوە بـا لەسەر ئایەتێك بوەستێ كە پەیوەندی بە ئایەتەكانی پێش خۆیەوە هەیە و، وە دوا وشەی ئایەتەكەش بێت.

١٦) وە با قورئـان خـوێن لـە كـاتی دەسـت پێكـردن یـا كۆتـایی هێنـان بـە قورئان خوێندنەكەی خۆی پەیوەست نەكات بە كۆتـایی (جـوزء) و (حیـزب) و (عەشـەر) ە كانـەوە، چـونكە زۆربـەی جـار لـە نیـوەی قـسەدا و پـچڕانی پەیوەنـدی واتاكـان بـە یەكـەوە (جـوزء) و (حیـزب) و (عەشـەر) ە ی تـازە دەست پێ دەكات.

١٧) وە بـــا خوێندنەوەكـــە بـــە جـــوانی و تێـــر و تەســـەلی بـــێ، چـــونكە خوێندنەوەی سورەتێكی كورت بە تێر و تەسـەلی چاكترە لـە خوێندنـەوەی سورەتێكی دوورو درێژ كە حەقی خۆی پێ نەدرابێت.

## بەشی حەوتەم

## سەجدەی قورئان خوێندن

**١) پێناسەکەی:**

هەرکەس ئایەتێ لە ئایەتەکانی سوژدەی خوێند یا گوێی لێ بوو کەسێك خوێندی موستەحەببە (الله أكبر) بکات و سوژدەیەك بەرێ و، ئەو نزایە بخوێنێ کە پێغەمبەر (ﷺ) تێیدا خوێندووە ، لە پاشا سەر بەرز بکاتەوە لە سوژدەکە .

لە (ئیبنوعومەر) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( **أن النبي (ﷺ) كان يقرأ القرآن ، فيقرأ سورة فيها سجدة ، فيسجد ونسجد معه ، حتى ما يجد بعضنا موضعا لمكان جبهته** ))[٣٦]

واتە : جاران کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەو سورەتانەی دەخوێند کە ئایەتی کوڕنووش (ئایەتی سەجدە) یان تیایە، بۆ خۆی کوڕنووشی قورئان خوێندنی دەبرد و ئێمەش لەگەڵیا ئەو کوڕنووشەمان دەبرد، جا لە بەر زۆری عەشاماتەکە هەندێکمان جێگەی دەست نەدەکەوت هەتا لە کاتی کوڕنووشەکەدا تەوێڵی لەسەر دانێ.

---

[٣٦] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (سجود القرآن) ، بابی: (من سجد لسجود القارئ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٧٥) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (المساجد ومواضع الصلاة) ، بابی: (سجود القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٩٥) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الصلاة) ، بابی: (في الرجل يسمع السجدة وهو راكب ، أو في غير الصلاة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤١٢).

**٢) شێوازەکەی:**

١) زانایانی (فیقه) هاوڕان لەسەر ئەوەی کە سەجدەی تیلاوە تەنها یەك سەجدەیە.

٢) پێویستە بەو جۆرە سەجدەکە ببرێ کە لە سەجدەی نوێژا دەبرێت.

٣) هەروەها (تەکبیرەی إحرام) و (سەلامدانەوەی) تێدا نییە، (ئیبنوتەیمیە) لەم بارەوە دەفەرموێ: ئەمەش سوننەتی دیاری پێغەمبەرە (ﷺ) و، وە زۆربەی پێشینان لەسەر ئەم شێوازە پەیڕەویان کردووە و ، وە پێشەوا دیارو بەناوبانگەکانیش.

وە لەبارەی سەلامدانەوە لە سەجدەی تیلاوەدا: (ابن عبدالبر) لە (التمهید/ ج ١٩، ص ١٣٤) دا ئەوەی نەقڵ کردووە: کە پێشەوا (مالیك) و (شافیعی) و (ئەحمەد) و (ئەبوحەنیفە) لەگەڵ ئەوەدا نین کە سەلامدانەوە لە سەجدەی تیلاوەدا هەبێ.

**٣) فەزڵی سەجدەی تیلاوە:**

أ- لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( **إذا قرأ ابن آدم السجدة فسجد اعتزل الشيطان يبكي ، يقول: يا ويله – وفي رواية أبي كريب: يا ويلي– أمر ابن آدم بالسجود فسجد فله الجنة ، وأمرت بالسجود فأبيت فلي النار** ))[٣٧]

---

[٣٧] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (الإیمان) ، بابی : (بیان إطلاق اسم الکفر علی من ترك الصلاة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٤٠) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (إقامة الصلاة والسنة فیها) ، بابی: (سجود القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٥٢).

واتە : کاتێ ئادەمیزاد کە ئایەتی سەجدە دەخوێنێ و سەجدەی تیلاوەت دەبا بۆ خوا، شەیتان لە تاوانا کلا دەبێ و کەنار دەگرێ و دەڵێ: ئەی هاوار لە خۆی، لە گێڕانەوەیەکی ترا: دەڵێ: ئەی هاوار لە خۆم! فەرمان کرا بە ئادەمیزاد کوڕنووش بباو کوڕنووشی بردو بەهەشتی بۆ بوو، وە فەرمان کرا بە من کە کوڕنووش ببەم، بەڵام من کوڕنووشم نەبرد و ئاگری دۆزەخم بۆ مایەوە.

ب- لە (ثوبان) ی کوڕی (بجدد) ی هاشمییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( **عليك بكثرة السجود لله ، فإنك لا تسجد لله سجدة ، إلا رفعك الله بها درجة ، وحط عنك بها خطيئة** ))[38]

واتە : هەتا دەتوانیت نوێژێکی بێ شومار بکە بۆ خوا، چونکە هەموو جارێ کە سەجدەیە بۆ خوا دەبەیت خوای گەورە بەو سەجدەیە یەك پایە بەرزت دەکاتەوە و یەك گوناهیشت لێ هەڵدەوەرێنێ.

ج- لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( ... ، **فمنهم من يوبق بعمله ، ومنهم من يخردل ثم ينجو ، حتى إذا أراد الله رحمة من أراد من أهل النار ، أمر الله الملائكة: أن يخرجوا من كان يعبد الله ، فيخرجونهم ويعرفونهم بآثار السجود ، وحرم الله على النار أن تأكل أثر السجود ، فيخرجون من النار ، فكل ابن آدم**

---

[38] **صحيح** - (موسليم) لە کتابی (الصلاة) ، بابی: (فضل السجود والحث عليه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٩٣) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الصلاة) ، بابی: (ما جاء في كثرة الركوع والسجود) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٨٨).

**تأكله النار إلا أثر السجود ، فيخرجون من النار ، قد امتحشوا فيصب عليهم ماء الحياة ، فينبتون كما تنبت الحبة في حميل السيل ، ثم يفرغ الله من القضاء بين العباد .. ))**[٣٩]

واتـه: جـا هەيانـه بـەهۆی کـردەوەی نالەباریانـەوە بـه فـەتارەت دەچـن، هەیشیانە لەبەر کردەوەی بەدی خۆی قولاپـەکان ئـەنجن ئـەنجیان دەکـەن، لەپاشا ڕزگاریان دەبێ، هەتا کاتێ خوای گەورە خواست دەکا کە ڕەحم بەو بڕوادارانـە بکـا، کـە هێـشتا لـە دۆزەخـدا مـاون و دۆزەخـین، فـەرمان بـە مەلائیکەتـەکان دەکـا: کـە هەرکەسـێ خواپـەرست بووبـێ لـە دۆزەخ دەری بهێـنن، ئـەوانیش لـە دۆزەخ دەریـان دەهێـنن و بـە شـوێنەواری سـەجدە باوەڕدارەکان لەناو ئاگری دۆزەخدا دەناسنەوە و دەریـان دەهێـنن، چـونکە خوای گەورە شوێنەواری سـەجدە و کوڕنووشـی لـە ئـاگر قەدەغـە کـردووە، ئاگری دۆزەخ ناوچەوانی باوڕدار ناسووتێنێ، ئیتر لـە دۆزەخ دێنـە دەرەوە، کاتێ دێنە دەرەوە بوون بە سووتەمەڕۆ، جا ئاوی ژیانیان پیا دەکەن، ئـیتر وەك تۆمـەی نـاو لیـوەی لافـاو سـەوز دەبنـەوە و دەبنـەوە بـە مرۆڤێکـی ئاسایی، ئەوجا خوا لە دادگایی نێوانی بەندەکانی لێ دەبێتەوە.

---

[٣٩] **صحيح** - (بوخـاری) لـه کتـابی (الأذان) بـابی: (أبـواب صـفة الـصلاة - بـاب فـضل الـسجود) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٨٥) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الإیمان) ، بابی: (معرفـة طریـق الرؤیـة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٩٣).

**٤) حوكمەكەی:**

جومهوری زانایان لەسەر ئەوە یەکڕان کەوا سوژدەی تیلاوەت کارێکی پەسەند و شەرعیە بۆ خوێنەرو گوێگر ، ئەویش بەپێی ئەو ئایەت و فەرموودانەی کە لەوبارەوە هاتوون :

١) خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْرَٰٓءِيلَ وَمِمَّنْ هَدَيْنَا وَٱجْتَبَيْنَآ ۚ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُ ٱلرَّحْمَٰنِ خَرُّواْ سُجَّدًا وَبُكِيًّا ۩ ﴾ (مريم: ٥٨)

واتە : ئا ئەوانە کەسانێکن کە خوای گەورە نازو نیعمەتی بەسەردا ڕشتوون لە پێغەمبەران، لە نەوەی ئادەم و ئەوانەش (کە لە کەشتیەکەدا) لەگەڵ نوحدا سوارمان کردن و لە نەوەی ئیبراهیم و یەعقوب و لەوانەی کە هیدایەتمان داون و هەڵمان بژاردوون ، ئەوانە هەر کاتێك ئایەتەکانی خوای میهرەبانیان بەسەردا بخوێنرێتەوە ، بە پەلە سوژدە دەبەن و ئەسرین لە دیدەیان دەبارێت و دەگرین .

٢) هەروەها دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِهَا خَرُّواْ سُجَّدًا وَسَبَّحُواْ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ۩ ﴾ (السجدة : ١٥)

واتە : بەڕاستی تەنها ئەوانە بڕوا بە ئایەتەکانی ئێمە دەهێنن، کاتێك یاداوەری دەکرێن پێی، خێرا سوژدە دەبەن تەسبحات و سوپاسگوزاری پەروەردگاریان دەکەن، لە کاتێکدا ئەوانە بە هیچ شێوەیەك فیزیان نیە و خۆیان بە گەورە نازانن.

٣) لـــه (ئیبنوعومــــەر) ە وە (خــوای لێ ڕازی بێــت) دەگێڕنـــەوە کـــەوا فەرموویەتی: (( **أن النبي** (ﷺ) **كان يقرأ القرآن ، فيقرأ سورة فيها سجدة ، فيسجد ونسجد معه ، حتى ما يجد بعضنا موضعا لمكان جبهته** ))[٤٠]

واتـە : جـاران کـە پێغەمبـەر (ﷺ) ئـەو سـورەتانەی دەخوێنـد کـە ئایـەتی کوڕنـووش (ئایـەتی سـەجدە) یـان تیایـە، بـۆ خـۆی کوڕنووشـی قورئـان خوێندنی دەبرد و ئێمـەش لەگـەڵیا ئـەو کوڕنووشـەمان دەبـرد، جـا لـە بـەر زۆری عەشـاماتەکە هەنـدێکمان جێگـەی دەسـت نەدەکـەوت هـەتا لـە کـاتی کوڕنووشەکەدا تەوێڵی لەسەر دانێ.

**بەڵام زانایان جیاوازن لەوەدا ئایا واجبە یا سوننە؟ جـا لەبـەر ئـەوە بـوون بـە دوو دەستەوە:**

**دەستەی یەکەم***: دەڵێن: واجبـە، کـە ئەمـەش مەزهـەبی (سـوفیانی ثـوری) و (ئەبوحەنیفە) و لە گێڕانەوەیـەکا (ئەحمـەد) و، هـەروەها هەڵبـژاردەی (ابـن تیمیة) شە.

**دەستەی دووەم** *: دەڵێن : موسـتەحەببە نـەك واجـب ، کـە ئەمـەش ڕێـڕەوی زۆربەی زانایانە:

---

[٤٠] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (سجود القرآن) ، بابی : (من سجد لسجود القاريء) گێڕاویەتـەوە بـە ژمارە (١٠٧٥) ، هەروەها (موسلیم) لە کتـابی (المساجد ومواضع الصلاة) ، بـابی: (سـجود القـرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٩٥) ، هەروەها (ئەبوداود) لـە کتـابی (الـصلاة) ، بـابی: (في الرجـل يـسمع السجدة وهو راكب ، أو في غير الصلاة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤١٢).

* (فتح القدير/ ج ١ ، ص ٣٨٢) ، و (ابن عابدين/ ج ٢ ، ص ١٠٣) ، و (مجموع الفتـاوى/ ج ٢٣ ، ص ١٣٩– ١٥٥) ، و (الإنصاف/ ج ٢ ، ص ١٩٣).

**لەناو هاوەڵاندا:** (عومەری کوڕی خەتتاب) و (سەلمانی فارسی) و (ئیبنوعەبباس) و (عیمرانی کوڕی حوصەین) ە.

**لەناو زانایانی تابیعیندا:** پێشەوا (مالیك) و (شافیعی) و (ئەوزاعی) و (لیث) و (ئەحمەد) و (ئیسحاق) و (أبي ثور) و (داود) و (ابن حزم) ە.

١) لە (ڕەبیعە) ی کوڕی (عبدالله) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( **عما حضر ربيعة من عمر بن الخطاب رضي الله عنه ، قرأ يوم الجمعة على المنبر بسورة النحل حتى إذا جاء السجدة نزل ، فسجد وسجد الناس حتى إذا كانت الجمعة القابلة قرأ بها ، حتى إذا جاء السجدة ، قال: يا أيها الناس إنا نمر بالسجود ، فمن سجد ، فقد أصاب ومن لم يسجد، فلا إثم عليه، ولم يسجد عمر رضي الله عنه** ))[٤١]

واتە: ڕۆژێکی جومعە لەسەر مینبەر (عومەری کوڕی خەتتاب) (خوای لێ ڕازی بێت) سورەتی (النحل) ی خوێندەوە، کە گەیشتە ئایەتەکەی کوڕنووش لە مینبەرەکە دابەزی و کوڕنووشی تیلاوەتی برد و خەڵکەکەش کوڕنووشیان برد، وە لە جومعەی ئایندەدا دیسانەوە ئەم سورەتەی خوێندەوە، بەڵام کاتێ کە گەیشتە سەر ئایەتەکەی سەجدە فەرمووی: ئەی خەڵکینە ! ئەوا دەگەینە سەر ئایەتی کوڕنووش جا ئەوی کوڕنووش دەبا ئەوە دەق بەپێی سوننەت و ڕەوشتی پێغەمبەر (ﷺ) ڕەفتار دەکا، وە

---

* (المجموع/ ج ٤ ، ص ٦١) ، و (كشاف القناع/ ج ١ ، ص ٤٤٥) ، و (المواهب/ ج ٢ ، ص ٦٠) ، و (التمهيد/ ج ١٩ ، ص ١٣٣) ، و (المحلى/ ج ٥ ، ص ١٠٥).

[٤١] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (سجود القرآن) ، بابی : (من رأى أن الله عز وجل لم يوجب السجود) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٧٧).

ئەوەشی کورنووش نەبا ئـەوە تـاوانی لەسـەر نیـە و گونـاهی ناگـا ، چونکە کورنووشی تیلاوەت بەڕای من سوننەتە و واجب نیـە ، (ڕەبیعـە) دەڵـێ: وە عومەر خۆی کورنووشی نەبرد.

٢) لە (نافیع) ەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەگێڕنەوە کـەوا فەرموویـەتی: (ئیبنـو عومــەر) (خــوای لێ ڕازی بێــت) فەرموویــەتی: (( **إن الله لم يفـرض السجود إلا أن نشاء** ))[٤٢]

واتە : خوای گەورە کە سەجدەی تیلاوەتی داناوە بۆمـان فـەرزی نـەکردووە لەسەرمان، بە ئارەزووی خۆمانە دەتوانین لە پاش ئایەتی سەجدە، سەجدە بەرین، دەشتوانین سەجدە نەبەین.

**٥) ئایا دەستنوێژ و ڕووکردنە قیبلەی دەوێ؟**

جومهوری زانایان بۆ ئەوەچوون کە چۆن نوێژ پێویستی بـە دەسـت نوێـژ و ڕووکردنە قیبلـە هەیـە ئاوەهـاش سـەجدەی تـیلاوە دەسـتنوێژ و ڕووکردنـە قیبلەی دەوێ *.

**بەڵام (ابن حزم) و (ابن تيمية) بۆ ئەوەچوون:** کە سـەجدەی تیلاوە پێویستی بە دەست نوێژ و ڕووکردنە قیبلە نییە، لەبەر ئەوەی سەجدەی تیلاوە نوێژ نیە بەڵکو تەنها سەجدەیەکە و بەس، هەروەها ئەمـە مەزهـەبی (ئیبنوعومـەر) و (شەعبی) و (بوخاری) شە.

---

[٤٢] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (سجود القرآن) ، بابی: (من رأى أن الله عز وجل لم يوجب السجود) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٧٧).

* (ابن عابـدين/ ج ٢ ، ص ١٠٦) ، و (المجمـوع / ج ٤ ، ص ٦٣) ، و (الدسـوقي/ ج ١ ، ص ٣٠٧) ، و (المغني/ ج ١، ص٦٥٠).

**(شەوكانی) ش دەفەرموێ:** لە حەدیسەكانی سەجدەی تیلاوەتدا شتێكی وا نەهاتووە كە بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی سەجدەبەر دەبێ دەستنوێژی هەبێت، وە پێغەمبەر سەجدەی بردووە، وە ئەوانەی دەوروپشتی سەجدەیان بردووە بە قورئان خوێندنەكەی، وە نەهاتووە فەرمانی دابێت بە كەسێك بچێت دەستنوێژ بگرێت، وە زۆر دووریشە هەموویان دەستنوێژیان هەبوو بێت، هەروەها بێ باوەڕەكانیش سەجدەیان لەگەڵ بردووە، هەرچەندە پیسن و دەستنوێژیان دروست نەبووە.

ئیمام (بوخاری) لە (ئیبنوعومەر) ە وە دەگێڕێتەوە كەوا: ئەو بەبێ دەستنوێژ سەجدەی بردووە .

بەڵام ئەوەی (بەیهەقی) گێڕاویەتەوە لێی بە ئیسنادێك كە حافظ لە (الفتح) دا دەفەرموێ: صەحیحە، كە فەرموویەتی: **(( لا یسجد الرجل إلا وهو طاهر ، .. ))**[43] واتە: پیاو بەپاكی نەبێت نابێ سەجدە بەرێت . ڕێكخستن لە نێوانیاندا دەكرێت بەوەی كە (حافظ) دەفەرموێ: مەبەست لەو پاكییە پاكی گەورەیە، یان حاڵەتی ئیختیارە، وە یەكەمیشیان لەسەر زەرورەت دادەنرێت.

هەروەها لە حەدیسەكاندا شتێكی وایان تێدا نیە كە بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی خاوێنی جل و بەرگ و جێگا ئیعتیباری بۆ بكرێت ، بەڵام عەورەت

---

[43] **موقوف** - (بەیهەقی) لە (السنن الكبری) دا لە كتابی (الطهارة) ، بابی: (استحباب الطهر للذكر والقراءة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٠٧).

داپۆشین و ڕووکردنە قیبلە لەگەڵ تواناداا، وتراوە بەڕای هەموو زانایان ئیعتیباری بۆ دەکرێت.

حافظ لە (الفتح) دا دەفەرموێ: کەس لەگەڵ (ئیبنوعومەر) دا ڕێك نەکەوتووە لەسەر ئەوەی سەجدەی تیلاوەت بێ دەستنوێژ دروستە جگە لە شەعبی نەبێ.

وە لە (أهل البيت) بنەماڵەی پێغەمبەردا (ﷺ) هەیە لەسەر ئەوە لەگەڵ (ئیبنوعومەر) دا پێکهاتوون ، لەوانە (ئەبوتاڵیب) و (المنصور بالله).

**٦) نزا و پاڕانەوەی سەجدەی قورئان خوێندن:**

أ- لە دایکە (عائیشە ) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( **كان رسول الله (ﷺ) يقول في سجود القرآن بالليل ، يقول في السجدة مرارا: سجد وجهي للذي خلقه ، وشق سمعه وبصره ، بحوله وقوته** ))[٤٤]

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە سجودی قورئان خوێندندا لە شەواندا لە هەر سەجدەیەکدا چەند جارێك دەیفەرموو: من ڕووم بۆ ئەو زاتە ناوەتە زەوی کە دروستی کردووە بە جوانترین شێوە، وە گوێ و چاوی لێ دەرهێناوە، ئەویش تەنها بە هەوڵ و توانای خۆی.

---

[٤٤] **صحيح** - (ئەبوداود) لە کتابی (الصلاة) ، بابی: (ما يقول إذا سجد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤١٤)، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الصلاة) ، بابی: (في سجود القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٨٠)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (التطبيق) ، بابی: (نوع آخر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١١٢) ، هەروەها (حاكم) لە (مستدرك) دا لە کتابی (الإمامة) دا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٤٨).

ب- لـه دایکـه (عائیـشه ) ه وه (خـوای لیّ ڕازی بیّـت) دهگیّڕنـهوه کـهوا فهرموویهتی: (( **كان رسول الله (ﷺ) يقول في سجود القرآن بالليل: سجد وجهي للذي خلقه ، وشق سمعه وبصره ، بحوله وقوته ، فتبارك الله أحسن الخالقين** ))[٤٥]

واتـه: پیّغهمبـهری خـوا (ﷺ) لـه سـجودی قورئـان خویّندنـدا لـه شـهواندا دهیفهرموو: مـن ڕووم بـۆ ئـهو زاتـه ناوهتـه زهوی کـه دروسـتی کـردووه بـه جوانترین شیّوه، وه گویّ و چاوی لیّ دهرهیّناوه، ئهویش تـهنها بـه هـهولّ و توانای خۆی، پاکی و بیّگهردی بۆ ئهو خوایهی که چاکترینی بهدیهیّنهرانه.

ج- له (عهلی ) کوڕی (ئهبی تالّیب) ه وه (خـوای لیّ ڕازی بیّـت) دهگیّڕنـهوه کهوا پیّغهمبهری خوا (ﷺ) کاتیّ سهجدهی ببردایه دهیفـهرموو: (( **اللهم لك سجدت ، وبك آمنت ، ولك أسلمت ، سجد وجهي للذي خلقه ، وصوره ، وشق سمعه وبصره ، تبارك الله أحسن الخالقين** ))[٤٦]

---

[٤٥] **صحيح** - (حاكم) له (مستدرك) دا له کتـابی (الإمامـة) گیّڕاویهتـهوه بـه ژمـاره (٧٤٨) ، هـهروهها (بهیههقی) له کتابی (الصلاة) ، بابی: (ما يقول في سجود التلاوة) گیّڕاویهتهوه به ژماره (٣٥٢١).

[٤٦] **صحيح** - (موسلیم) له کتابی (صلاة المسافرين وقصرها) ، بابی: (الدعاء في صلاة الليل وقيامه) گیّڕاویهتهوه به ژماره (١٨٠٩) ، ههروهها (ئهبوداود) له کتابی (الصلاة) ، بـابی: (من ذكر أنه يرفع يديه إذا قام من الثنتين) گیّڕاویهتهوه به ژماره (٧٤٤) ، ههروهها (ترمذی) له کتابی (الصلاة) ، بابی: (ما يقول الرجل إذا رفع رأسه من الركوع) گیّڕاویهتـهوه بـه ژمـاره (٢٦٦) ، هـهروهها (نهسائی) لـه کتابی (الإفتتاح) ، بابی: (نوع آخر من الذكر والدعاء بين التكبير والقراءة) گیّڕاویهتـهوه بـه ژمـاره (٨٩٦) ، ههروهها (ابن ماجه) له کتابی (إقامة الصلاة والسنة فيها) ، بابی: (رفع اليدين إذا ركع وإذا رفع رأسه من الركوع) گیّڕاویهتهوه به ژماره (٨٦٤).

واته: خوایه بۆ تۆ سەجدەم بردووە، وە بە تۆ باوەڕم هێناوە، وە خۆم تەسلیمی تۆ کردووە، من ڕووم بۆ ئەو زاتە ناوەتە زەوی کە دروستی کردووە و وێنەی کێشاوە بە جوانترین شێوە، وە گوێ و چاوی لێ دەرهێناوە، زۆرە خێر و بەرەکەتی خوا، کە چاکترین بەدیهێنەرە.

٤) لە (ئیبنو عەبباس) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( **جاء رجل إلى النبي (ﷺ) فقال : يا رسول الله (ﷺ) ، رأيتني الليلة وأنا نائم كأني كنت أصلي خلف شجرة ، فسجدت فسجدت الشجرة لسجودي ، فسمعتها وهي تقول: اللهم اكتب لي بها عندك أجرا ، وضع عني بها وزرا ، واجعلها لي عندك ذخرا ، وتقبلها مني كما تقبلتها من عبدك داود** )) [٤٧]

واتە : پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)! ئەمشەو لە خەوما بینیم، وەك ئەوەی لە پشت درەختێکەوە نوێژ بکەم، جا سوجدەم برد درەختەکەش بە هۆی سوجدەکەی منەوە سوجدەی برد، جا لە سوجدەکەدا گوێم لێی بوو دەیوت: خوایە بە هۆی ئەم کڕنووشەوە لە لای خۆت پاداشتم بۆ بنووسە و، بە هۆیەوە لە گوناهم لا ببە و، لە لای خۆت پاداشتەکەیم بۆ هەڵبگرە و، وەلێم وەربگرە هەروەك چۆن لە بەندەی خۆت داوود پێغەمبەرت وەرگرت.

---

[٤٧] **حسن** - (ترمذی) لە کتابی (الصلاة) ، بابی: (ما يقول في سجود القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٧٩) ، هەروەها (ابن ماجە) لە کتابی (إقامة الصلاة والسنة فيها) ، بابی: (سجود القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٥٢).

**٧) سەجدەی تیلاوە لە کاتە قەدەغەکراوەکاندا:**

مادام سەجدەی تیلاوە نوێژ نیە ئەوا دروستە لە هەر کاتێکدا کە قورئانت خوێند یا بۆیان خوێندی و گەیشتە ئایەتی سەجدە سەجدەکە ببەیت، چونکە ئەو فەرموودانەی کە لەو بارەوە هاتوون تەنها تایبەتن بە نوێژ، ئەمەش ڕێڕەوی پێشەوا (شافیعی) و لە گێڕانەوەیەکا (ئەحمەد) و هەروەها قسەی (ابن حزم) یشە*.

**٨) دووبارە بوونەوەی سەجدەی تیلاوە:**

ئەگەر هاتوو زیاد لە یەك جار ئایەتی سەجدەت خوێند یان گوێت لێوەی بوو، ئەوە وا چاکە بۆ هەموو ئایەتی سەجدەیەك سەجدەی تیلاوە ببەیت، ئەمەش ڕێڕەوی جمهوری زانایانە جگە لە پێشەوا (ئەبوحەنیفە) کە پێی وایە یەکجار بەسە*.

**٩) سەجدەی تیلاوە لە نوێژدا:**

لە (ئەبی ڕافیع) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: **(( صليت مع أبي هريرة صلاة العتمة فقرأ: ﴿إذا السماء انشقت﴾ فسجد فيها ، فقلت له: ما هذه السجدة؟ فقال: سجدت بها خلف أبي القاسم (ﷺ)، فلا أزال أسجد بها حتى ألقاه ))**[٤٨]

---

* (المغني/ ج ١، ص٦٢٣) ، و (المحلى/ ج ٥، ص ١٠٥) ، و (بداية المجتهد/ ج ١، ص ٣٢٨).

* (فتح القدير/ ج ٢، ص ٢٢) ، و (الدسوقي/ ج ١، ص ٣١١) ، و (مغني المحتاج/ ج ١، ص ٤٦٦) ، و (الإنصاف/ ج ٢، ص ١٩٦).

[٤٨] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الأذان) ، بابی: (الجهر في العشاء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٦٦) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (المساجد ومواضع الصلاة) ، بابی: (سجود التلاوة) گێڕاویەتەوە بە

واتـه : جارێکیـان (ئـەبوهورەیرە) (خـوای لێ ڕازی بێـت) بەرنوێـژی نوێـژی خـەوتنانی بۆ کـردین، جـا سـورەتی ﴿إذا السماء انشقت﴾ ی خوێنـد کـە گەیـشتە ئایـەتی: ﴿ وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ ٱلْقُرْءَانُ لَا يَسْجُدُونَ ۩ ﴿٢١﴾ ﴾ * کوڕنووشـی برد ، کە لە نوێژ بووینەوە وتم : ئەم کوڕنووشە چی بوو؟ وتـی: لـە پـشتی پێغەمبەرەوە (ﷺ) نوێژم کردووە و لە دوای ئەم ئایەتەوە لەناو ئەو نوێژەدا لەگـەڵ پێغەمبـەردا (ﷺ) سـەجدەی تـیلاوەتم بـردووە، لەبـەر ئـەوە هـەتا دەگەمەوە بە خزمەتی لە بەهەشتا لەم شوێنەدا ئەم کوڕنووشە هـەر دەبـەم و هەرگیز وازی لێ ناهێنم.

**١٠) ئایە دروستە لە نوێژدا تێپەڕی بەسەر ئایەتی سەجدەدا و نەیخوێنێ؟**

لەلای جمهوری زانایان مەکروهە و دروست نییـە، بـەڵکو وا چـاکە کـە کاتـێ قورئان دەخوێنێ و گەیشتی بە ئایەتی سـەجدە سـەجدە ببـەیت، هـەروەها گێڕاوەتەوە لـە (شـەعبی) و (ابـن المـسیب) و (ابـن سـیرین) و (نەخـەعی) و (ئیسحاق) یش کە ئەوانیش پێیان مەکروهە و لەلایان دروست نیە *.

---

ژمارە (١٣٠٤) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الصلاة) ، بابی: (من رأى فيها السجود) گێڕاویەتـەوە بە ژمارە (١٤٠٨) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الإفتتاح) ، بابی: (السجود في الفريضة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٦٧).

* (الإنشقاق: ٢١).

* (البدائع/ ج ١، ص ١٩٢) ، و (كشاف القناع/ ج ١، ص ٤٤٩) ، و (الدسوقي/ ج ١، ص ٣٠٩).

**١١) ئايا دروسته هەموو ئايەتەكانی سەجدەی تيلاوە بخوێنی و تەنها يەك سەجدە بەريت؟**

نەخێر دروست نييە، بەڵكو وا چاكە كە كاتێ قورئان دەخوێنی و گەيشتی بە هەر ئايەتێكی سەجدە سەجدە ببەيت*.

**١٢) قەزاكردنەوەی سەجدەی تيلاوەت:**

جومهوری زانايان لايان وايە موستەحەببە دوای خوێندنی يا بيستنی ئايەتی سەجدە سەجدە ببرێت، جا ئەگەر دواخرا لەكۆڵ ناكەوێت، بە مەرجێك ماوەكە زۆر نەخايەنێت، بەڵام ئەگەر زۆری خاياند ئەوە دەچێت و قەزا ناكرێتەوە .

**دوو تێبينی گرنگ:**

**يەكەم:** پانزە (١٥) شوێن هەيە لە قورئاندا سوننەتە كەوا سەجدەيان تێدا ببردرێت، بەڵام ئەگەر لە نوێژدا بوو بۆ سەجدەی (ص) سەجدە نەبرێت، چونكە سوننەتێكی دووپات كراوە نيە ، بەڵام لە دەرەوەی نوێژ بخوێندرێ ئەوا سوننەتە بۆ هەر پانزە شوێنەكە سەجدە ببردرێ.

**دووەم:** ئەو نزايەی كەوا لە سەجدەی (ص) دا دەخوێندرێ جيايە لەو نزايەی كە لە چواردە سەجدەكەی تردا دەخوێندرێ، بۆ نموونە لە هەر چواردە سەجدەكەدا ئەم نزايە دەخوێندرێ: (**سجد وجهي للذي خلقه ، وشق**

---

* (الكافي – لإبن قدامة/ ج ١، ص ١٦٠) ، (المدونة / ج ١، ص ١١١ – ١١٢) ، و (روضة الطالبين / ج ١، ص ٣٢٣).

**سمعه وبصره بحوله وقوته فتبارك الله أحسن الخالقين)** ، یاخود ئەمەیان **(اللهم لك سجدت ، وبك آمنت ، ولك أسلمت ، سجد وجهي للذي خلقه ، وصوره ، وشق سمعه وبصره ، تبارك الله أحسن الخالقين)**.

بەڵام لە سەجدەی (ص) دا تەنها ئەم نزایە دەخوێندرێ: **(اللهم اكتب لي بها عندك أجرا، وضع عني بها وزرا ، واجعلها لي عندك ذخرا ، وتقبلها مني كما تقبلتها من عبدك داود)**.

**١٣) سەجدەكانی قورئان خوێندن:**

پانزە (١٥) شوێن هەیە لە قورئاندا سوننەتە كەوا سەجدەیان تێدا ببردرێت، بەڵام لەلای زانایان ئەم مەسەلەیە جیاوازی تێكەوتووە و بۆ ئەو مەبەستە سەجدەكانی قورئان دەبن بە سێ بەشەوە:

**یەكەم: ئەو سەجدانەی كەوا زانایان یەكڕان لە بارەیەوە:**

**١- ئایەتی (٢٠٦) ی سورەتی (الأعراف):** ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسۡجُدُونَ ۩ ٢٠٦ ﴾

**٢- ئایەتی (١٥) ی سورەتی (الرعد):** ﴿ وَلِلَّهِ يَسۡجُدُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ طَوۡعٗا وَكَرۡهٗا وَظِلَٰلُهُم بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ ۩ ١٥ ﴾

**٣- ئایەتی (٤٩) ی سورەتی (النحل):** ﴿ وَلِلَّهِ يَسۡجُدُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن دَآبَّةٖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ ٤٩ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوۡقِهِمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ۩ ٥٠ ﴾

٤- ئايـەتی (١٠٧) ی سـورەتی (الإسـراء): ﴿قُلْ ءَامِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوْ لَا تُؤْمِنُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا ﴿١٠٧﴾ وَيَقُولُونَ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولًا ﴿١٠٨﴾ وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا ۩ ﴿١٠٩﴾﴾

٥- ئايـەتی (٥٨) ی سـورەتی (مـريم): ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّۦنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْرَٰٓءِيلَ وَمِمَّنْ هَدَيْنَا وَٱجْتَبَيْنَآ ۚ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُ ٱلرَّحْمَٰنِ خَرُّوا۟ سُجَّدًا وَبُكِيًّا ۩ ﴿٥٨﴾﴾

٦- ئايـەتی (١٨) ی سـورەتی (الحـج): ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ ۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ۩ ﴿١٨﴾﴾

٧- ئايـەتی (٦٠) ی سـورەتی (الفرقـان): ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسْجُدُوا۟ لِلرَّحْمَٰنِ قَالُوا۟ وَمَا ٱلرَّحْمَٰنُ أَنَسْجُدُ لِمَا تَأْمُرُنَا وَزَادَهُمْ نُفُورًا ۩ ﴿٦٠﴾﴾

٨- ئايـەتی (٢٥) ی سـورەتی (النمـل): ﴿أَلَّا يَسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى يُخْرِجُ ٱلْخَبْءَ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ۩ ﴿٢٦﴾﴾

٩- ئايەتی (١٥) ی سورەتی (السجدة): ﴿إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِهَا خَرُّوا۟ سُجَّدًا وَسَبَّحُوا۟ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ۩ ﴿١٥﴾﴾

١٠- ئایەتی (٣٧) ی سورەتی (فصلت): ﴿وَمِنْ ءَايَـٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ
وَٱلْقَمَرُ ۚ لَا تَسْجُدُوا۟ لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ
إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿٣٧﴾ فَإِنِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فَٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيْلِ
وَٱلنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْـَٔمُونَ ۩ ﴿٣٨﴾﴾

**دووەم: ئەو سەجدانەی کەوا جێی جیاوازی زانایانە و ، بەڵگەی ڕاست و دروستیش لەبارەیانەوە هەیە:**

١١- ئایەتی (٢٤) ی سورەتی (ص): ﴿قَالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦ ۖ وَإِنَّ
كَثِيرًا مِّنَ ٱلْخُلَطَآءِ لَيَبْغِى بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ ۗ
وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّـٰهُ فَٱسْتَغْفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ ۩ ﴿٢٤﴾﴾

لەلای پێشەوا (ئەبوحەنیفە) و (سوفیانی ثوری) و (ئەحمەد) و لە گێڕانەوەیەکدا (ئیسحاق) و (أبي ثور) جێگەی سەجدە بردنە*، بەڵگەشیان:

أ- لە (ئیبنوعەبباس) ەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا وتوویەتی: (( **أن النبي (ﷺ) سجد في ص وقال: سجدها داود توبة ، ونسجدها شكرا** ))[٤٩]

---

* (التمهيد/ ج ١٩، ص ١٣١) ، و (البدائع/ ج ١، ص ١٩٣) ، و (الدسوقي/ ج ١، ص ٣٠٨) ، و (المغني/ ج ١، ص ٦١٨) ، و (المجموع/ ج ٤، ص ٦٠).

[٤٩] **صحيح** - (نەسائی) لە کتابی (الإفتتاح) ، بابی: (سجود القرآن السجود في ﴿ص﴾ ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٥٦) ، هەروەها (دارەقوتنی) لە (سنن) ە کەیدا لە کتابی (الصلاة) ، بابی: (سجود القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣).

واتە : خۆم دیومە کە پێغەمبەر (ﷺ) لە ئایەتی سەجدەی سورەتی (ص) دا کڕنووشی تیا دەبرد و دەیفەرموو: ئەمە بۆ داوود سەجدەی تەوبە بوو، بەڵام بۆ ئێمە سەجدەی شوکرە.

ب- لە (ئیبنوعەبباس) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( **ص لیس من عزائم السجود ، وقد رأیت النبي (ﷺ) یسجد فیها** ))[50] واتە : ئایەتەکەی سورەتی (ص) لە ئایەتە دامەزراوەکانی سەجدەی تیلاوەت نییە، لەگەڵ ئەمەشا من بە چاوی خۆم دیومە کە پێغەمبەر (ﷺ) کڕنووشی تیا دەبرد .

ج- (عەووام) ی کوڕی (حوشب) ی کوڕی (یەزید) ی شەیبانی دەڵێ: (( **سألت مجاهدا ، عن سجدة في ﴿ص﴾ ، فقال: سألت ابن عباس: من أین سجدت؟ فقال: أوما تقرأ: ﴿ومن ذریته داود وسلیمان * أولئك الذین هدى الله فبهداهم اقتده﴾ ، فكان داود ممن أمر نبیكم (ﷺ) أن یقتدي به ، فسجدها داود علیه السلام ، فسجدها رسول الله (ﷺ)** ))[51]

واتە : لە بارەی سەجدەکەی سورەتی (ص) ە وە پرسیارم لە (موجاهید) کرد (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) ، لە وەڵامدا فەرمووی: منیش ئەم پرسیارەم لە (ئیبنوعەبباس) کرد (خوای لێ ڕازی بێت) پێم وت: ئەم سەجدەیەت لە

---

[50] **صحیح** - (بوخاری) لە کتابی (سجود القرآن) ، بابی: (سجدة ص) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٦٩) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الصلاة) ، بابی: (السجود في ص) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٠٩) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (السفر) ، بابی: (ما جاء في السجدة في ص) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٧٧).

[51] **صحیح** - (بوخاری) لە کتابی (تفسیر القرآن) ، بابی: (سورة ص) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٨٠٧).

کێ وەرگرت؟ فەرمووی: ئایا ئەم ئایەتانەت نەخوێندۆتەوە کە دەفەرموێ:

﴿وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٤﴾ وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلْيَاسَ ۖ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٥﴾ وَإِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا ۚ وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٦﴾ وَمِنْ ءَابَآئِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ وَإِخْوَٰنِهِمْ ۖ وَٱجْتَبَيْنَٰهُمْ وَهَدَيْنَٰهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٨٧﴾ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۚ وَلَوْ أَشْرَكُوا۟ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٨٨﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ۚ فَإِن يَكْفُرْ بِهَا هَٰٓؤُلَآءِ فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُوا۟ بِهَا بِكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْ ۗ﴾[*] جا (داوود پێغەمبەر) یەکێکە لەو پێغەمبەرانەی کە فەرمان کراوە بە پێغەمبەری ئێوە (ﷺ) کە شوێنیان بکەوێ و ئیقتیدایان پێ بکات، جا لەوێدا (داوود پێغەمبەر) سەجدەی بردووە، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) لەبەر ئەو فەرمانە سەجدەی بردووە.

د- لە (موجاهید) ە وە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەگێڕنەوە کەوا پرسیاری لە (ئیبنوعەبباس) کرد (خوای لێ ڕازی بێت): (( **أفي ص سجود قال: نعم، ثم تلا ووهبنا له حتى بلغ فبهداهم اقتده قال: هو منهم، وقال ابن عباس: رأيت عمر قرأ: ﴿ص﴾ على المنبر، فنزل فسجد فيها، ثم رقي على المنبر** ))[٥٢]

---

[*] (الأنعام: ٨٤ – ٩٠).

[٥٢] **إسناده صحيح** – (عبدالرزاق) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (صلاة العيدين)، بابی: (كم في القرآن من سجدة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٨٦٢)، هەروەها (ابن أبي شيبة) لە (مصنف) ە

واتە : ئایا لە سورەتی (ص) دا سەجدەی تیلاوە هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ هەیە، لەپاشا ئەم ئایەتانەی خوێندەوە: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَـٰقَ وَيَعْقُوبَ ۚ كُلًّا هَدَيْنَا ۚ وَنُوحًا هَدَيْنَا مِن قَبْلُ ۖ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَـٰنَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَـٰرُونَ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٤﴾ وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلْيَاسَ ۖ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٨٥﴾ وَإِسْمَـٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا ۚ وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٨٦﴾ وَمِنْ ءَابَآئِهِمْ وَذُرِّيَّـٰتِهِمْ وَإِخْوَٰنِهِمْ ۖ وَٱجْتَبَيْنَـٰهُمْ وَهَدَيْنَـٰهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٨٧﴾ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۚ وَلَوْ أَشْرَكُوا۟ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٨٨﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَـٰهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ۚ فَإِن يَكْفُرْ بِهَا هَـٰٓؤُلَآءِ فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُوا۟ بِهَا بِكَـٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْ ۗ قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا ۖ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْعَـٰلَمِينَ ﴿٩٠﴾﴾* ، ئەوجا فەرمووی: (داوود پێغەمبەر) یش یەکێکە لەوان، وە هەروەها فەرمووی: جارێکیان (عومەر) م بینی لەسەر مینبەر سورەتی (ص) ی دەخوێند، جا کاتێ گەیشتە ئەو شوێنەی کە باسی سەجدەکەی (داوود) دەکا لە مینبەرەکە دابەزی و سەجدەی برد .

---

کەیدا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٢٦٧) ، هەروەها (ابن المنذر) لە کتێبی (الأوسط) دا لە کتابی (سجود القرآن) دا لە ژێر ناونیشانی : (ذكر العلة التي لها سجد رسول الله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٧٣٤).

* (الأنعام : ٨٤ – ٩٠).

هـ- له (سائیب) ی کوڕی (یەزید) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا وتوویەتی: (( رأيت عثمان سجد في ﴿ص﴾ ))[٥٣]

واتە : (عوسمانی کوڕی عەففان) م دی لە خوێندنی ئایەتەکەی سورەتی (ص) دا سەجدەی تیلاوەی برد.

* ئەو سێ ئایەتەش کە لە سورەتی (النجم) و (الإنشقاق) و (العلق) دا هاتوون لەلای پێشەوایان (ئەبوحەنیفە) و (سوفیانی ثوری) و (شافیعی) و (ئەحمەد) جێی سەجدە بردنن و سەجدەی تێدا دەبرێن[*] .

١٢- ئایەتی (٦٢) ی سورەتی (النجم): ﴿ فَٱسۡجُدُواْ لِلَّهِۤ وَٱعۡبُدُواْ ۩ ﴿٦٢﴾ ﴾

أ- له (عبدالله) ی کوڕی (مەسعود) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا وتوویەتی: (( قرأ النبي (ﷺ) النجم بمكة فسجد فيها وسجد من معه غير شيخ أخذ كفا من حصى - أو تراب - فرفعه إلى جبهته ، وقال : يكفيني هذا ، فرأيته بعد ذلك قتل كافرا ))[٥٤]

---

[٥٣] **إسناده صحيح** - (عبدالرزاق) له (مصنف) ە کەیدا له کتابی (صلاة العيدين) ، بابی : (كم في القرآن من سجدة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٨٦٤) ، هەروەها (ابن أبی شيبة) لە (مصنف) ە کەیدا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٢٥٧).

[*] (التمهيد/ ج ١٩، ص ١٣١) ، و (البدائع/ ج ١، ص ١٩٣) ، و (المغني / ج ١، ص ٦١٧) ، و (المجموع/ ج ٤، ص ٦٢).

[٥٤] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (سجود القرآن) ، بابی: (ما جاء في سجود القرآن وسنتها) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٦٧) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (المساجد) ، بابی: (سجود التلاوة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٩٧) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الصلاة) ، بابی: (من رأى فيها السجود) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٠٦) ، هەروەها (نەسائی) له کتابی (الإفتتاح) ، بابی: (السجود في ﴿والنجم﴾ ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٥٨).

واتە : لە مەككە پێغەمبەر (ﷺ) سورەتی (النجم) ی خوێند و كوڕنووشی تیا برد، ئەوانیش كە لەوێ بوون لەگەڵیا كوڕنووشیان برد، تەنیا پیرەمێردێ نەبێ كە گوێلێ چەو یا لاگوێلێ خۆڵی هەڵگرت و بەرزی كردەوە بۆ تەوێڵی و وتی: ئەمەم بەسە، لەوەودوا ئەم پیرەمێردەم* دی بە كافری مرد.

ب- لە (ئیبنوعەبباس) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا وتوویەتی: (( **أن النبي (ﷺ) سجد بالنجم ، وسجد معه المسلمون والمشركون والجن والإنس** ))[55]

واتە : پێغەمبەر (ﷺ) لە دوای ئایەتەكەی سەجدەی سورەتی (النجم) ە وە كوڕنووشی برد، موسوڵمانەكان و هاوبەش پەیداكاران و جنۆكە و ئادەمیزاد، ئەوەی لەوێ بوو، هەموو كوڕنووشیان برد لەگەڵیا.

**١٣- ئایەتی (٢١) ی سورەتی (الإنشقاق):** ﴿وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنُ لَا يَسْجُدُونَ ۩ ﴾

أ- لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا وتوویەتی: (( **سجدنا مع النبي (ﷺ) في ﴿إذا السماء انشقت﴾ و ﴿اقرأ باسم ربك﴾** ))[56]

---

* **ناوی:** (ئومەیەی كوڕی خەڵەف) بوو، لە غەزای (بەدر) دا بە بێ بڕوایی كوژرا.

[55] **صحيح** - (بوخاری) لە كتابی (سجود القرآن) ، بابی: (سجود المسلمين مع المشركين والمشرك نجس ليس له وضوء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٧١).

[56] **صحيح** - (موسلیم) لە كتابی (المساجد ومواضع الصلاة) ، بابی: (سجود التلاوة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٠١) ، هەروەها (ئەبوداود) لە كتابی (الصلاة) ، بابی: (السجود في ﴿إذا السماء انشقت﴾ و ﴿اقرأ﴾ ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٠٧) ، هەروەها (ترمذی) لە كتابی (الصلاة) ، بابی: (ما جاء في السجدة في ﴿اقرأ باسم ربك الذي خلق﴾ و ﴿إذا السماء انشقت﴾ ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٧٣) ،

واته : له سورەتی ﴿إذا السماء انشقت﴾ لە کاتی خوێندنی: ﴿وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ الْقُرْءَانُ لَا يَسْجُدُونَ ۩﴾ دا ، وه له سورەتی ﴿اقرأ باسم ربك﴾ له کاتی خوێندنی: ﴿كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَاسْجُدْ وَاقْتَرِب ۩﴾ دا ، لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) کوڕنووشی تیلاوەتمان دەبرد.

ب- له (ئەبی ڕافیع) ە وه (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوه کەوا فەرموویەتی: (( **صليت مع أبي هريرة صلاة العتمة فقرأ: ﴿إذا السماء انشقت﴾ فسجد فيها ، فقلت له: ما هذه السجدة ؟ فقال: سجدت بها خلف أبي القاسم (ﷺ) ، فلا أزال أسجد بها حتى ألقاه**))[57]

واته : جارێکیان (ئەبوهورەیره) (خوای لێ ڕازی بێت) بەرنوێژی نوێژی خەوتنانی بۆ کردین، جا سورەتی ﴿إذا السماء انشقت﴾ ی خوێند که گەیشته ئایەتی: ﴿وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ الْقُرْءَانُ لَا يَسْجُدُونَ ۩ (٢١)﴾ [*] کوڕنووشی برد، که له نوێژ بووینەوه وتم: ئەم کوڕنووشه چی بوو؟ وتی: له پشتی

---

هەروەها (نەسائی) له کتابی (الإفتتاح) ، بابی: (السجود في ﴿اقرأ باسم ربك﴾ ) گێڕاویەتەوه به ژماره (٩٦٦) ، هەروەها (ابن ماجه) له کتابی (إقامة الصلاة والسنة فيها) ، بابی: (عدد السجود القرآن) گێڕاویەتەوه به ژماره (١٠٥٨).

[57] **صحيح** - (بوخاری) له کتابی (الأذان) ، بابی: (الجهر في العشاء) گێڕاویەتەوه به ژماره (٧٦٦) ، هەروەها (موسلیم) له کتابی (المساجد ومواضع الصلاة) ، بابی: (سجود التلاوة) گێڕاویەتەوه به ژماره (١٣٠٤) ، هەروەها (ئەبوداود) له کتابی (الصلاة) ، بابی: (من رأى فيها السجود) گێڕاویەتەوه به ژماره (١٤٠٨) ، هەروەها (نەسائی) له کتابی (الإفتتاح) ، بابی: (السجود في الفريضة) گێڕاویەتەوه به ژماره (٩٦٧).

[*] (الإنشقاق : ٢١).

پێغەمبەرەوە (ﷺ) نوێژم کردووە و لە دوای ئەم ئایەتەوە لەناو ئەو نوێژەدا لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) سەجدەی تیلاوەتم بردووە، لەبەر ئەوە هەتا دەگەمەوە بە خزمەتی لە بەهەشتا لەم شوێنەدا ئەم کڕنووشە هەر دەبەم و هەرگیز وازی لێ ناهێنم.

**١٤- ئایەتی (١٩) ی سورەتی (العلق):** ﴿ كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَاسْجُدْ وَاقْتَرِب ۩ ﴿١٩﴾ ﴾

أ- لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا وتوویەتی: (( **سجدنا مع النبي** (ﷺ) **في** ﴿**إذا السماء انشقت**﴾ **و**﴿**اقرأ باسم ربك**﴾ ))[٥٨]

واتە : لە سورەتی ﴿**إذا السماء انشقت**﴾ لە کاتی خوێندنی: ﴿ وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنُ لَا يَسْجُدُونَ ۩ ﴾ دا ، وە لە سورەتی ﴿اقرأ باسم ربك﴾ لە کاتی خوێندنی: ﴿ كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَاسْجُدْ وَاقْتَرِب ۩ ﴾ دا ، لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) کڕنووشی تیلاوەتمان دەبرد.

ب- لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا وتوویەتی: (( **سجد أبو بكر وعمر رضي الله عنهما ومن هو خير منهما في إذا السماء انشقت ، واقرأ باسم ربك** ))[٥٩]

---

[٥٨] **صحيح** - (موسليم) لە کتابی (المساجد ومواضع الصلاة) ، بابی: (سجود التلاوة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٠١) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الصلاة) ، بابی: (السجود في ﴿إذا السماء انشقت﴾ و ﴿اقرأ﴾ ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٠٧) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الصلاة) ، بابی: (ما جاء في السجدة في ﴿اقرأ باسم ربك الذي خلق﴾ و ﴿إذا السماء انشقت﴾ ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٧٣) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الإفتتاح) ، بابی: (السجود في ﴿اقرأ باسم ربك﴾ ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٦٦) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (إقامة الصلاة والسنة فيها) ، بابی: (عدد السجود القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٥٨).

واتە : دیومە کە (ئەبوبەکر) و (عومەر) و لەوانیش چاکتر کە پێغەمبەرە (ﷺ) لە سورەتی ﴿إذا السماء انشقت﴾ لە کاتی خوێندنی: ﴿ وَإِذَا قُرِئَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقُرۡءَانُ لَا يَسۡجُدُونَ ۩ ﴾ دا ، وە لە سورەتی ﴿اقرأ باسم ربك﴾ لە کاتی خوێندنی: ﴿ كَلَّا لَا تُطِعۡهُ وَٱسۡجُدۡ وَٱقۡتَرِب ۩ ﴾ دا ، سەجدەیان دەبرد.

**سێیەم: ئەو سەجدەیەی کەوا زانایان جیاوازییان تێدا هەیە و ، هیچ بەڵگەیەکی ڕاستیش لە بارەیەوە نەهاتووە:**

**١٥- ئایەتی (٧٧) ی سورەتی (الحج):** ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ۩ ﴿٧٧﴾ ﴾

ئەم ئایەتە لەلای پێشەوا (شافیعی) و (ئەحمەد) جێی سەجدەیە ، بەڵگەشیان:

ڕیوایەتەکەی (عوقبە) ی کوڕی (عامیر) ە (خوای لێ ڕازی بێت) کەوا فەرمووی: (( **قلت لرسول الله (ﷺ): أفي سورة الحج سجدتان؟ قال: نعم ، ومن لم يسجدهما ، فلا يقرأهما** ))[٦٠]

---

[٥٩] **صحيح** - (نەسائی) لە کتابی (الإفتتاح) ، بابی: (السجود في ﴿اقرأ باسم ربك﴾ ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٦٥).

[٦٠] **ضعيف** - (ئەبوداود) لە کتابی (الصلاة) ، بابی: (تفريع أبواب السجود) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٠٢) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (السفر) ، بابی: (في السجدة في الحج) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٧٨) ، هەروەها (ئەحمەد) لە موسنەدەکەیدا لە ژێر ناونیشانی: (مسند الشاميين- حديث عقبة بن عامر الجهني عن النبي (ﷺ) ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٧٠٧٨).

واتە : وتم بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) : ئایا لە سورەتی (الحج) دا دوو ئایەتی سەجدەی تیایە؟ فەرمووی: بەڵێ، وە ئەوەی لە کاتی خوێندنی ئەو دوو ئایەتەدا کڕنووش نەبا ئەوە با نەشیان خوێنێ.

بەڵام کۆمەڵێ لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) ڕایان وایە کە سەجدەی تێدا دەبرێت، لەوانە: (عومەری کوڕی خەتتاب) و (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) و (ئیبنوعومەر) و (ئیبنوعەبباس) و (ئیبنومەسعود) و (ئەبوموسای ئەشعەری) و (أبوالدرداء) و (عەمماری کوڕی یاسر) (خوایان لێ ڕازی بێت).

# بەشی هەشتەم
# خەتم کردنی قورئانی مەجید

## یەکەم: ئادابەکانی خەتم کردنی قورئان

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لەم بارەوە لە (أذكار) دا فەرموویەتی*:

موستەحەببە بۆ ئەوکەسەی کەوا بە تەنها خەتمەکەی دەکات لە نوێژدا بێت، بەڵام بۆ ئەوکەسەی کەلە دەرەوەی نوێژدا خەتمەکەی ئەنجام دەدات و، وە بۆ ئەو کۆمەڵەش کە بە جەماعی دانیشتوون لە مەراسیمی قورئان خەتم کردندا، ئەوە وا چاکە کەلە سەرەتای شەوەوە، یاخود لە سەرەتای ڕۆژەوە دانیشن بۆ مەراسیمی ئەو خەتم کردنە.

وە موستەحەببە ئەو ڕۆژەی کە ئەو خەتمەی تێدا دەکرێ ئەوکەسە بە ڕۆژوو بێت، مەگەر بکەوێتە ڕۆژێکەوە کەوا شەرع قەدەغەی کردووە لە ڕۆژوو گرتن تێیدا.

وە لە گێڕانەوەی ڕاستدا هاتووە: کەوا (تەڵحە) ی کوڕی (موصەڕیف) و، (موسەییەب) ی کوڕی (ڕافیع) و، (حەبیب) ی کوڕی (ئەبی ثابیت) ی تابیعین و کوفیینەوە (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ) ئەو ڕۆژەی کە خەتمی قورئانیان تێدا دەکرد ڕۆژەکەی بە ڕۆژوو دەبوون.

---

* (نيل الأوطار بتخريج أحاديث كتاب الأذكار/ ج ١، ص ٢٦٣).

وە موستەحەببە کەوا هەموو کەسێ کە شارەزایی لە قورئان خوێندندا هەیە و، وە ئەوکەسانەش کە خوێندنەوەیان تەواو نیە و باش نازانن قورئان بخوێنن حازری ئەو مەجلیسە بن کە قورئانی تێدا خەتم دەکرێت.

**جا بۆ زیاتر دڵنیابوون ئاماژە بۆچەند فەرموودەیەك دەكەین:**

١) لە (ئوم عەتییە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی : (( **أمرنا رسول الله (ﷺ): أن نخرجهن في الفطر والأضحى ، العواتق ، والحيض ، وذوات الخدور ، فأما الحيض فيعتزلن الصلاة ، ويشهدن الخير ، ودعوة المسلمين ، قلت: يا رسول الله (ﷺ) إحدانا لا يكون لها جلباب ، قال: لتلبسها أختها من جلبابها** ))[٦١]

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێکردین کە ئافرەتان بنێرین بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان لەوانەش: کچە عازەب، ئەوانەی لە حەیزدان، ئەوانەش کە خۆیان دەرنەدەخست، جا ئەو ئافرەتانەی کەلە حەیزدابوون کەنارگیردەبوون و دووریان دەگرت لە شوێنی نوێژەکەیان، بەڵام ئامادەی خێر و دوعای موسوڵمانەکان دەبوون، وتم: ئەی پێغەمبەری

---

[٦١] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (صلاة العيدين) ، بابی : (ذكر إباحة خروج النساء في العيدين إلى المصلى وشهود الخطبة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٥٣) ، هەروەها (ترمزی) لە کتابی (الصلاة) ، بابی : (ما جاء في خروج النساء في العيدين) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٤٠) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (إقامة الصلاة والسنة فيها) ، بابی : (ما جاء في خروج النساء في العيدين) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٠٧).

خوا (ﷺ) یەکێکمان باڵا پۆشی نیە؟ فەرمووی: با خوشکەکەی لە جل و بەرگی خۆی بکاتە بەری.

٢) لە (قەتادە) ی تابیعی یەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) – کە هاوەڵی (ئەنەس) بووە (خوای لێ ڕازی بێت) – دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی:

(( كان أنس بن مالك ((رضي الله عنه)) إذا ختم القرآن جمع أهله ودعا ))[٦٢]

واتە : ئەنەسی کوڕی مالیك (خوای لێ ڕازی بێت) کاتێ خەتمی قورئانی بکردایە کەس و کاری خۆی کۆدەکردەوە و دەپاڕایەوە .

٣) لە (سابت) ە وە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی:

(( كان أنس إذا ختم القرآن ، جمع ولده وأهل بيته فدعا لهم ))[٦٣]

واتە : (ئەنەس) (خوای لێ ڕازی بێت) کاتێ خەتمی قورئانی بکردایە، منداڵەکان و خاوو خێزانی ماڵەکەی کۆدەکردەوە و نزای بۆ دەکردن.

٤) لە (حەکەم) ی کوڕی (عوتەیبە) وە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( **أرسل إلي مجاهد ، وعبدة بن أبي لبابة ، قالا : إنما أرسلنا إليك أنا نريد أن نختم القرآن ، وكان يقال: إن الدعاء يستجاب عند ختم القرآن ، فلما فرغوا من ختم القرآن دعوا بدعوات** ))[٦٤]

---

[٦٢] **موقوف صحيح** – (ابن أبی داود) لە (كتاب المصاحف) دا گێڕاویەتەوە ، هەروەها (ابن حجر) و دانەرەکەشی بە (صحیح) یان داناوە ، هەروەك لە (الفتوحات الربانية/ ج ٣، ص ٢٤٤) دا هاتووە.

[٦٣] (دارەمی) لە کتابی (فضائل القرآن) ، بابی: (في ختم القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٤٠٩).

[٦٤] **صحيح** - (ابن أبي شيبة) لە کتابی (فضائل القرآن) ، بابی: (في الرجل إذا ختم ما يصنع) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٠٨٩) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (شعب الإيمان) دا فەصڵی: (في قطع القراءة بحمد الله تعالى على ما أنعم عليه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٠٧) ، هەروەها لە (فضائل القرآن: لقاسم بن سلام) ، بابی: (فضل ختم القرآن) بە ژمارە (٨٥) هاتووە ، هەروەها لە (فضائل القرآن: لإبن

واته : (موجاهید) و (عەبدەی کوڕی ئەبی لوبابە) ناردیان بە شوێنمدا و پێیان وتم: ئێمە بۆیە ناردمان بە شوێنتدا چونکە نیازمانە خەتمی قورئان بکەین، وە وتیان: بەڕاستی نزا و پاڕانەوە لە کاتی خەتم کردنی قورئاندا گیرایە، جا کاتێ لە خەتمی قورئانەکە بوونەوە چەند دوعا و نزایەکیان کرد.

٥) لە (حەکەم) ی کوڕی (عوتەیبە) وە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەگێڕنەوە کەوا (موجاهید) (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: (( **الرحمة تنزل عند ختم القرآن** ))[٦٥] واتە: ڕەحمەت و میهرەبانی خوا لە کاتی خەتم کردنی قورئاندا دادەبەزێت.

## دووەم: شێوازی خەتم کردنی زانایان و خواناسانی پێشوو

**پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لەم بارەوە لە (الأذكار) دا فەرموویەتی**[*] :

پێشینان (خوایان لێ ڕازی بێت) چەند عاداتێکی جیاوازیان بووە لە بارەی خەتم کردنی قورئانی پیرۆزەوە:

١) تیایاندا بووە کۆمەڵێ لەوان کەوا لە ماوەی دوو مانگدا خەتمێکیان کردووە.

٢) وە هەندێکی تریان لە ماوەی یەك مانگدا خەتمێکیان کردووە.

---

الضريس) ، بابی: (الرجل إذا ختم القرآن ما يصنع) بە ژمارە (٤٨) هاتووە ، هەروەها (الفريابي) لە کتێبی (فضائل القرآن) دا ، بابی: (ختم القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٩).

[٦٥] **صحيح** - (ابن أبي شيبة) لە کتابی (فضائل القرآن) ، بابی: (في الرجل إذا ختم ما يصنع) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٩٤٣٦) ، هەروەها لە (قيام رمضان – لمحمد بن نصر المروزي) ، بابی: (الترغيب في الدعاء عند ختم القرآن) بە ژمارە (٥٤) هاتووە.

[*] (نيل الأوطار بتخريج أحاديث كتاب الأذكار / ج ١ – ص ٢٥٩).

٣) وە هەندێکی تریان لە ماوەی هەر دە شەو جارێکدا خەتمێکیان کردووە.

٤) وە هەندێکی تریان لە ماوەی هەر هەشت شەو جارێکدا خەتمێکیان کردووە.

٥) وە هەندێکی تریان لە ماوەی هەر حەوت شەو جارێکدا خەتمێکیان کردووە. جا ئەمەیان زۆربەی پێشینان کردوویانە.

٦) وە هەندێکی تریان لە ماوەی هەر شەش شەو جارێکدا خەتمێکیان کردووە.

٧) وە هەندێکی تریان لە ماوەی هەر پێنج شەو جارێکدا خەتمێکیان کردووە.

٨) وە هەندێکی تریان لە ماوەی هەر چوار شەو جارێکدا خەتمێکیان کردووە.

٩) وە هەروەها زۆرێکیان لە ماوەی هەر سێ شەو جارێکدا خەتمێکیان کردووە.

١٠) وە هەروەها زۆرێکی تریان لە ماوەی هەر شەوو ڕۆژێکدا خەتمێکیان کردووە.

١١) وە هەروەها کۆمەڵێکیان بووە کەوا لە ماوەی شەوو ڕۆژێکدا دوو خەتمەیان کردووە.

١٢) وە هەروەها هەندێکیان بووە کەوا لە ماوەی شەوو ڕۆژێکدا سێ خەتمەیان کردووە.

١٣) وه هەروەها هەندێکی تریان بووه کەوا خەتمەکەی لە ماوەی شەوو ڕۆژێکدا هەشت خەتمە بووە، چواریان لە شەودا، وه چوارەکەی تریش لە ڕۆژدا، وه لەوانەش کە لەم جۆرە خەتمەیان بووە بریتی یە لە بەڕێز: (ابن الکاتب الصوفی) (خوای لێ ڕازی بێ).

**هەروەها دەفەرموێ:** (ئەحمەد) ی دورقی لە (مەنصور) ی کوڕی (زاذان) ی کوڕی (عوبباد) ی تابیعی یەوه دەگێڕێتەوە کەوا: (قورئان) ی خەتم کردووه لە نێوانی (نیوەڕۆ) و (عەصر) دا، وه هەروەها دەڵێ: لە مانگی ڕەمەزاندا (قورئان) ی خەتم کردووه لە نێوان (مەغریب) و (عیشا) دا نزیکەی دوو خەتم و شتێ.

هەروەها (ابن أبی داود) بە سەنەدێکی دروست گێڕاویەتەوە کەوا: (موجاهید) (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) خەتمی قورئانی کردووه لە ڕەمەزاندا لە نێوان (مەغریب) و (عیشا) دا.

**هەروەها (نەوەوی) دەفەرموێ:** بەڵام ئەوانەی کەوا خەتمی قورئانیان کردووه لە یەك ڕکاتدا، لەبەر زۆرییان ناژمێردرێن، لەوانە: (عوسمان) ی کوڕی (عەففان)، (تەمیمی داری)، (سەعید) ی کوڕی (جوبەیر).

وه بێگومان زۆرێك لە کۆمەڵە پێشکەوتووەکان بە کەراهەتیان زانیوه کەوا لە ماوەی شەوو ڕۆژێکدا خەتمی قورئان بکرێت، بەڵگەش لەسەری ئەم فەرموودەیەیە:

کە لە (عبدالله) ی کوڕی (عەمر) ی کوڕی (عاص) ه وه دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: **((لا یفقه من قرأ القرآن في**

**أقل من ثلاث))**[٦٦] واتە: ئەوی بە سێ شەو کەمتر خەتمەیەکی قورئان بکات ئەوە لە دەستووری خوێندنی قورئان تێ نەگەییوە.

بەڵام سەبارەت بە کاتی دەست پێکردن و خەتم کردنی (قورئان) پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەگەر لەوانە بوو کە لە هەفتەیەکدا خەتمی قورئانی دەکرد، ئەوە بێگومان (عوسمان) ی کوڕی (عەففان) (خوای لێ ڕازی بێت) لە شەوی جومعەوە دەستی پێ دەکرد و، وە لە شەوی پێنج شەممەدا کۆتایی پێ دەهێنا و خەتمی دەکرد.

**وە پێشەوا (ئەبوحامید) ی غەزالی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە (الإحیاء) دا**[*] **فەرموویەتی:**

چاکتر وایە کە ئەو خەتم کردنە جارێ لە شەودا بێ و، جارێکیش لە ڕۆژدا، وە خەتم کردنەکەی ڕۆژ با لە دوو ڕکاتەکەی بەیانی ڕۆژی دوو شەممەدا بێت، یاخود لە دوای ئەو دوو ڕکاتەوە بێ و، وە خەتم کردنەکەی شەویش با لە دوو ڕکاتەکەی مەغریبی شەوی جومعەدا بێ، یاخود لە دوای ئەو دوو ڕکاتەوە بێت.

---

[٦٦] **صحيح** - (ئەبوداود) لە کتابی (الصلاة)، بابی: (تحزیب القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٩٤)، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (القراءات)، بابی: (١٣) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٩٤٨)، هەروەها (ابن ماحه) لە کتابی (إقامة الصلاة والسنة فیها)، بابی: (في کم یستحب یختم القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٤٧).

[*] (إحیاء علوم الدین / ج ١، ص ٦٢٠ – کتاب: آداب تلاوة القرآن).

١) (ئیبنو ئەبی داود) لە (عەمر) ی کوڕی (مەڕڕە) ی تابیعی یەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کەوا فەرموویەتی: (( **كانوا يحبون أن يختم القرآن من أول الليل أو من أول النهار** ))*

واتە: پێیان خۆشبووە کەوا لە سەرەتای شەودا یا لە سەرەتای ڕۆژدا خەتمی قورئان بکەن.

٢) هەروەها لە (تەڵحە) ی کوڕی (موصەڕیف) ی تابیعی پێشەواوە دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( **من ختم القرآن أية ساعة كانت من النهار، صلت عليه الملائكة حتى يمسي، وأية ساعة كانت من الليل صلت عليه الملائكة حتى يصبح** ))*

واتە: هەرکەسێ لە هەر کاتێکی ڕۆژدا خەتمی قورئان بکات، ئەوە مەلائیکە صڵاواتی لەسەر لێ دەدات هەتا ئێوارە، وە هەرکەسێ لە هەر کاتێکی شەودا خەتمی قورئان بکات، ئەوە مەلائیکە صڵاواتی لەسەر لێ دەدات هەتا بەیانی.

---

* (التبيان في آداب حملة القرآن / ج ١، ص ٢٤٠)، و (أذكار– لإمام النووي / ج ١، ص ٢٨).

* (التبيان في آداب حملة القرآن / ج ١، ص ٢٤٠)، و (أذكار– لإمام النووي / ج ١، ص ٢٨).

# بەشی نۆیەم
# فەزڵ و پاداشتی قورئان لەبەرکردن

## یەکەم: ڕێزگرتن لە قورئان لەبەر ڕێزگرتنە لەخوا

لە (ئەبوموسا) ی ئەشعەرییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( **إن من إجلال الله إكرام ذي الشيبة المسلم ، وحامل القرآن غير الغالي فيه والجافي عنه ، وإكرام ذي السلطان المقسط** ))[٦٧]

واتە : بەڕاستی ڕێزگرتن لە: پیرو بەساڵاچووی موسوڵمان و، قورئان لەبەرێك کە زیادەڕەوی تێدا نەکردبێ و پشتی لێ هەڵنەکردبێ و، فەرمانڕەوایەکی دادپەروەر، وەك ڕێزگرتن وایە لە خوای گەورە.

[٦٧] **حسن** - (بوخاری) لە (الأدب المفرد) دا ، بابی: (إجلال الكبير) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٧٥) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الأدب) ، بابی: (في تنزيل الناس منازلهم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٨٤٣) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (قتال أهل البغي) ، بابی: (النصيحة لله ولكتابه ورسوله ولأئمة المسلمين وعامتهم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٤٩١) ، هەروەها (ابن أبي شيبة) لە کتابی (البيوع والأقضية) ، بابی: (في الإمام العادل) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٤٦٦) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (الأدب المفرد/ ج ١، ص ١٣٠، ح ٣٥٧) ، و (سنن أبي داود/ ج ٤، ص ٢٦١، ح ٤٨٤٣) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٢١٩٩) ، و (مشكاة المصابيح/ ج ٣، ح ٤٩٧٢) ، و (صحيح الترغيب والترهيب/ ج ١، ح ٩٨) دا فەرموویەتی: (حسن) ه.

## دووەم: ئەوکەسەی قورئانی لەبەربێ ئاگری دۆزەخ تووخنی ناکەوێ

لە (عوقبە) ی کوڕی (عامیر) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( **لو جعل القرآن في إهاب، ثم ألقي في النار ما احترق** ))[٦٨]

واتە : ئەگەر قورئان بخرێتە ناو پێستێکەوە و دواتر فڕێ بدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە ئەوە بێگومان ناسووتێت.

کەواتە: هەر باوەڕدارێ قورئانی لەبەربێ و دواتر فڕێ بدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە ئەوە بێگومان ناسووتێ و قورئان دەبێتە قەڵغانێك بۆ پاراستنی لە ئاگری دۆزەخ.

## سێیەم: ئەوکەسەی شتێ لە قورئان لە سینگیا نەبێ وەك ماڵێکی وێرانە وایە

لە (ئیبنوعەبباس) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( **إن الذي ليس في جوفه شيء من القرآن كالبيت الخرب** ))[٦٩]

---

[٦٨] **حسن** - (ئەحمەد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (حديث عقبة بن عامر الجهني عن النبي (ﷺ) ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٧٠٣٢) ، هەروەها (دارەمی) لە کتابی (فضائل القرآن) ، بابی: (فضل من قرأ القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٤٦)، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (مشكاة المصابيح/ ج ١، ح ٢١٤٠)، و (سلسلة الأحاديث الصحيحة/ ج ٧، ح ٣٥٦٢) دا فەرموویەتی: (حسن) ە.

[٦٩] **ضعيف** - (ترمذی) لە کتابی (فضائل القرآن) ، بابی: (منه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٩١٣) ، هەروەها (ئەحمەد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی (مسند عبد الله بن العباس بن عبد المطلب) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٧٦) ، هەروەها (حاکم) لە (مستدرك) دا لە کتابی (فضائل القرآن) ، بابی: (أخبار في فضائل القرآن جملة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٨٠) ، هەروەها (دارەمی) لە کتابی (فضائل

واته : ئەوکەسەی شتێ لە قورئان لە سینگیا نەبێ وەك ماڵێكی وێرانە وایە.

## چوارەم: دەورکردنەوەی قورئان و هەوڵدان بۆ لەبیرنەچوونەوەی

١) لە (ئەبو موسا) ی ئەشعەری یەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (( **تعاهدوا هذا القرآن ، فوالذي نفس محمد بيده لهو أشد تفلتا من الإبل في عقلها** ))[٧٠]

واته : سەرەو كاری و ئاگاداری قورئان بكەن و هەمیشە دەوری بكەنەوە، دەسا بەوكەسە كە گیانی (محمد) ی بەدەسە، قورئان زووتر لەبیر دەچێتەوە كاتێ دەوری نەكرێتەوە، هەتا وشتر كاتێ لەپەت بەردەبێ و بەلەسە دەبێ! !

٢) لە (ئیبنوعومەر) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( **إنما مثل صاحب القرآن ، كمثل صاحب الإبل المعقلة ، إن عاهد عليها أمسكها ، وإن أطلقها ذهبت** ))[٧١]

---

القرآن) ، بابی: (فضل من قرأ القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٤٢) ، هەروەها (تەبەرانی) لە (المعجم الكبير) دا ، بابی: (من اسمه عبد الله: وما أسند عبد الله بن عباس رضي الله عنهما- أبو ظبيان عن ابن عباس) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٤٠٤) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (جامع الترمذي/ ج ٥، ص ١٧٧، ح ٢٩١٣) ، و (ضعيف الجامع الصغير/ ح ١٥٢٤) ، و (ضعيف الترغيب والترهيب / ج ١، ح ٨٧١)، و (رياض الصالحين/ ص ٣٨٨، ح ١٠٠٧) دا فەرموویەتی: (ضعيف) ە.

[٧٠] **صحيح** - (بوخاری) لە كتابی (فضائل القرآن) ، بابی: (استذكار القرآن وتعاهده) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٠٣٣) ، هەروەها (موسلیم) لە كتابی (صلاة المسافرين وقصرها) ، بابی: (الأمر بتعهد القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٤١).

[٧١] **صحيح** - (بوخاری) لە كتابی (فضائل القرآن) ، بابی: (استذكار القرآن وتعاهده) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٠٣١) ، (موسلیم) لە كتابی (صلاة المسافرين وقصرها) ، بابی: (الأمر بتعهد القرآن)

واته : قورئان خوێن وەك خاوەن وشتری بەستراوە وایە، چۆن ئەو ئەگەر چاودێری و سەرپەرشتی وشترەکانی بکات ئەوە لە دەستی ناچن و بە دەستیەوە دەمێننەوە، وە ئەگەر بەریشی بدا دەڕوات ، ئاوەها ئەمیش ئەگەر دەوری قورئانەکەی بە گەرمی بکاتەوە ئەوە لەبیری ناچێتەوە.

## پێنجەم: قورئان لەبەربوون دەبێتە هۆی پلە بەرزی لە بەهەشتا

لە (ئیبنوعومەر) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( **يقال لصاحب القرآن: اقرأ ، وارتق ، ورتل كما كنت ترتل في الدنيا ، فإن منزلك عند آخر آية تقرؤها** ))[72]

واتە : لە بەهەشتا بە قورئان خوێن دەڵێن: قورئانت چەندە لەبەرە بیخوێنە و بە پایەکانی بەهەشتا سەرکەوە، وە چۆن لە دنیادا قورئانت بە تەرتیل دەخوێند لێرەش هەروەها بە ئارامی و مۆڵەت و لەسەرخۆ بیخوێنە، چونکە پایەی تۆ لەو شوێنە دایە، کە دوا ئایەت دەخوێنی.

---

گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٣٦) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الإفتتاح) ، بابی: (جامع ما جاء في القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٤١).

[72] **حسن صحيح** - (ئەبوداود) لە کتابی (الصلاة) ، بابی: (استحباب الترتيل في القراءة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٦٤) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (فضائل القرآن) ، بابی: (١٨) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٩١٤) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبي داود/ ج ٢، ص ٧٣، ح ١٤٦٤) ، و (جامع الترمذي / ج ٥، ص ١٧٧، ح ٢٩١٤) ، و (صحيح الترغيب والترهيب/ ج ٢، ح ١٤٢٦) دا فەرموویەتی: سەنەدەکەی (حسن صحيح) ە.

## بابەتێکی تایبەت

## دروست نییە بڵێی فلان ئایەتم لەبیرچۆتەوە

پێشەوا نـەوەوی (ڕەحمـەتی خـوای لێ بـێ) لـەم بـارەوە لـە (أذکـار) دا فەرموویەتی[*] :

دروست نیه بڵێی: فلان ئایەت یا فـلان سورەتم لەبیرچـۆتەوە، بـەڵکو بڵـێ: لەبیرم کرد، یا (أسقطها).

١) له (عبدالله) ی کوڕی (مەسعود) ه وه (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کەوا پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: (( **بئـسما لأحـدهم أن يقـول نـسيت آيـة كيت وكيت ، بل نسي ، واستذكروا القرآن ، فإنه أشد تفصيا مـن صـدور الرجال من النعم** ))[٧٣]

واته : چەند خراپ و ناشرینه بۆ ئادەمیزاد که بڵێت: ئایەتی ئـەوە و ئـەوەم لەبیرچۆتەوە، بەڵکو ئەوە چارەنووسی خودایی لـەبیری بردۆتـەوە، کـەوابوو با بڵێ: فلان ئایـەتم لـە بیر براوەتـەوە ! کەواتـە دەوری قورئـان بکەنـەوە و بیکەن به پیشەی هەمیشەییتان، ئەگینا وەك چۆن وشتر کەلە پـەت بـەربوو بەلەسه دەبێ و ناگیرێتەوە، ئاوهاش قورئان له دڵی پیاودا زووتر له دەست دەردەچێ و نامێنێ.

---

[*] (نيل الأوطار بتخريج أحاديث كتاب الأذكار/ ج ١، ص ٢٧٤).

[٧٣] **صحيح** - (بوخاری) له کتابی (فضائل القرآن) ، بابی: (استذكار القرآن وتعاهده) گێڕاویەتـەوە بـه ژماره (٥٠٣٢) ، هەروەها (موسلیم) له کتابی (صلاة المسافرين وقصرها) ، بابی: (الأمر بتعهد القرآن) گێڕاویەتەوە به ژماره (١٨٣٨) ، هەروەها (ترمذی) له کتابی (القراءات) ، بـابی: (١٠٠) گێڕاویەتـەوە بـه ژمـاره (٢٩٤٢) ، هـەروەها (نەسـائی) لـه کتـابی (الإفتتـاح) ، بـابی: (جـامع مـا جـاء في القـرآن) گێڕاویەتەوە به ژماره (٩٤٢).

٢) لــه دايكــه (عائيــشه) وه (خــواى لىٚ ڕازى بێــت) دەگێڕنــەوه كــەوا فەرموويەتى: (( **سمع النبي (ﷺ) رجلا يقرأ بالليل ، فقال: يرحمه الله قد أذكرني آية كذا وكذا ، كنت أنسيتها من سورة كذا وكذا** )) [٧٤]

واته : شەوىٚ پياوىٚ له مزگەوت قورئانى دەخوێند، پێغەمبەر (ﷺ) گوێى لىٚ بوو، فەرمووى: ڕەحمەتى خواى لىٚ بىٚ ، ئـەم پيـاوه فـلاٚن ئايـەتى لـه فـلاٚن سورەت ياد خستمەوه، كه ئەو ئايەتەم له ياد براٻۆوه.

٣) له (عبدالله) ى كوڕى (مەسعود) ه وه (خـواى لىٚ ڕازى بێـت) دەگێڕنـەوه كەوا فەرموويەتى: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويـەتى: (( **بئسما للرجل أن يقول نسيت سورة كيت وكيت ، أو نسيت آية كيت وكيت ، بل هو نسي** )) [٧٥]

واته : چەند خراپ و ناشرينه بۆ پياوىٚ كـه بڵێـت: سورەتى ئـەوه و ئـەوەم لەبيرچـۆتەوه ، يـا ئايـەتى ئـەوه و ئـەوەم لەبيرچـۆتەوه، بـەڵكو ئـەوه چارەنووسى خودايى لەبيرى بردۆتەوه، كەوابوو با بڵىٚ: فلاٚن ئايـەتم لـه بـير براوەتەوه !

---

[٧٤] **صحيح** - (بوخارى) له كتابى (فضائل القرآن) ، بابى: (نسيان القرآن وهل يقول نسيت آية كذا وكذا) گێڕاويەتەوه به ژماره (٥٠٣٨) ، هەروەها (موسليم) لـه كتـابى (صلاة المسافرين وقصرها) ، بابى: (الأمر بتعهد القرآن) گێڕاويەتەوه به ژماره (١٨٣٤).

[٧٥] **صحيح** - (بوخارى) له كتابى (فضائل القرآن) ، بابى: (استذكار القرآن وتعاهده) گێڕاويەتـەوه بـه ژماره (٥٠٣٢) ، هەروەها (موسليم) له كتابى (صلاة المسافرين وقصرها) ، بابى: (الأمر بتعهد القرآن) گێڕاويەتەوه به ژماره (١٨٤٠).

# پێڕست

.............

